لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# وشەڕۆنان

## لە زمانی کوردیدا

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

چاپی دووەم

١٩٨٧

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# وشەڕۆنان

# لە زمانی کوردیدا

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# پێشەکی

ئەو نهێنییەی یاریدەی فێربون و ئاسـانکردنی بەکارهێنانی زمـانی داوە و مرۆڤی لە ئەرکی لەبەرکردنی هەزاران وشە ڕزگار کردوە ، ئەوەیـە کە تەنیا بەشێك لە وشەکانی زمان پێویسـتیان بە لەبەرکردن هەیـە؟ ئەو وشانەش ، ئەوانەن کە لە زماندا وەك دانەی ئامادە هەن • بەشێکی زۆری ئەم جۆرە وشانە بریتین لەوانە کە زۆر بەکار دەهێنرێن و هەر لە منداڵییەوە لای هەمو کەس نـاسراون ، وەك : کوڕ ، منداڵ ، خاڵ ، شـار ، ئـاگر ، چون ••• هتد • زمانناسان ئەم جۆرە وشانەیان ناو ناوە ( وشەی سادە ) ، کە لەگەڵ ( وشەی ناسـادە )دا ، وەك : کوڕێنـی ، منداڵی ، خـاڵۆزا ، شارستانی ، ئاگرنانەوە ، پێداچونەوە ••• جوداوازن • ئەگەر ئەو وشـە ناسادانە لەگەڵ سـادەکاندا بـەراورد بکەین بۆمـان دەردەکەوێ کە وا ناسادەکان بە سادەکانەوە بەستراون و لەسـەر بنچینەی ئەوان ڕۆنراون • بەو جۆرە وشەی ناسادە لە چاو وشەی سادەدا لە پلەی دووەمی زماندایە •

وشەی ناسادە ــ واتە ئەو وشانەی لە سەر بنچینەی وشەی تر دروست بوون ، کەرەستەی سەرەکی ئەم کتێبەمانە کە دەربارەی وشەڕۆنانە لە زمانی کوردیدا •

لە لێکۆڵینەوەی زماندا کێشەی دیـاری کردنی پارچە واتادارەکانی وشـە و نیشاندانی دەوریان و لێکـدانەوەی واتایان کارێـکی گرنگ و

پێویستە • ئەو جۆرە کارانە لە سەرێکەوە مەودای تێگەیشتن لە چۆنیەتی پێکهاتنی وشە فراوان دەکەن و لە سەرێکی تریشەوە ڕێگەیەکی باشن بۆ پێشخستن و گەشەپێدانی زمان •

مەسەلەی وشەڕۆنانی زمانی کوردی هەروەها لە خوێندنی زماندا زۆر گرنگە و دەبێتە هۆی ناسینی وشەکانی زمان و زانینی چۆنیەتی پێکهاتنیان•

هەرچەندە بە گشتی لێکۆڵینەوە دەربارەی زمانی کوردی کەمە ، بەڵام تا ڕادەیەك باسی ( مۆرفۆلۆژی ، فۆنەتیك ، سینتاکس ...) کراوە • ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ ، ئەوەیە تا ئێستا چ زانایانی کورد و چ زانایانی بێگانە لەبارەی (وشەڕۆنان)ی زمانی کوردییەوە شتێکی ئەوتۆیان نەنووسیوە و لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی وایان بڵاونەکردۆتەوە کە گشت ڕۆیەکی ئەم باسەی گرتبێتەوە • بێ‌گومان هەر لەبەر ئەو هۆیەشە گەلێك کێشەی ئەم زانستە ئاڵۆزە و بیر و باوەڕی جیاوازی تێدا زۆرە • بەشێك لەو وتار و کتێبانە کە لە ڕێزمانی کوردی دواون ، کەمێك باسی ڕۆنانی وشەیان کردوە و بە لای چەند کێشەیەکیدا چوون ... لێرەدا بە کورتی لە بارەی ئەوانەوە دەدوێین کە زیاتر بەرچاون •

یەکێك لەو کارە بەرچاوانە ئەو نامیلکە ٥٩ لاپەڕەیییەیە مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە ژێر ناوی « گرتنی کەلێنێکی‌تر لە ڕێزمانی کوردی»دا لە بارەی ( پێشگر و پاشگر )ەوە نووسیوێتی[١] • هەرچەندە نووسەر لە باسەکەیدا پەنجەی بۆ ئەوە ڕانەکێشاوە و لەوە نەدواوە کە پێشگر و پاشگر کەرەستەی گرنگی ڕۆنانی وشەن ، بەڵام بەرهەمەکەی کارێکی گەورە و بەنرخە • ئەو هەمو پێشگر و پاشگرانەی مامۆستا نوری عەلی ئەمین ماوەی ٢٠ ساڵێك لەمەوبەر دەرکی پێیان کردوە و تۆماری کردون و لێیان دواوە ،

---

(١) نوری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

ئەمڕۆ لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی وشەڕۆنانی زمانی کوردیدا کەرەستەیەکی کەم هاوتان و هێشتا زماناسانی کورد شتێکی ئەوتۆیان لێ زیاد نەکردوە •

بێ گومان ، ئەو کارە وەك تاقیکردنەوەیەکی یەکەم لە بارەی پێشگر و پاشگرەوە ناکرێ لە کەم و کورتی بێبەش بێ •

ناتەواوێ هەرە گەورەی نوسراوی ناوبراو لەوەدایە کە نیشانە لەگەڵ پێشگر و پاشگردا تێکەڵ کراوە ــ واتە بەشێوەی مانای ڕێزمانێ لە یەك جودا نەکراونەتەوە • نوسەر گەلێك نیشانە ، وەك : (تر)ی پلەی بەراورد و (ترین)ی پلەی بـالاّ و (ان)ی کۆ و (ەکە)ی ناسیـاوێ و (یـك ، ێ )ی نەناسیاوێ و کۆتایێ هەندێ کردار ( را ــ لە « کێڵرا ، ڕۆخێنرا ••• »)دا و ( رێ ــ لە « ئەخوێنرێ ، بنوسرێ •• » )دا بە پاشگر داناوە • (ئە)ی نیشانەی موزارەعەت و ( بـ )ی نیشانەی فەرمانی بە پێشگر داوەتە قەڵەم • ئەو نمونانەی سەرەوە کە پاشگر و پێشگری ڕێزمانین ، لەگەڵ پێشگر و پاشگری ڕاستەقینەی وشەداڕێژەردا جودا نەکراونەتەوە ، وەك پێشگری : ( ڕا ) ، وەك لە وشـەی « ڕاهاتن ، ڕاگرتن ••• »دا ؛ ( پێ ) لە وشەی « پێویسـت ، پێخەف ••• »دا ؛ ( هـەڵ ) لە وشـەی « هەڵچـون ، هەڵهێنان •••»دا ؛ پاشگری : (ۆڵ) لە وشەی «ئاسکۆڵ ، کرمۆڵ•••»دا ؛ ( کەر ) لە وشەی « سوالکەر ، نانکەر ••• »دا ؛ (انە) لە وشەی « ژنانە ، پیاوانە ••• »دا ••• کە پێشگر و پاشـگرن و یاریدەی ڕۆنانی وشـەی داڕێژراو دەدەن •

وەك من بەدیێ دەکەم و بۆی دەچم هۆی ئەم تێکەڵ کردن و جودا نەکردنەوەیە، ئەوەیە نوسەر بە تەواوێ بۆ ئەوە نەچووە کە پێشگر و پاشگر چین و جوداوازییان لەگەڵ نیشـانەدا چییە ••• ئەمەش لە پێناسـەکانی نوسەردا و لە لێکدانەوە و باس کردنی هەندێ کەرەستەدا بەدیێ دەکرێ •

کەم و کورتییەکی دیکەی ئەو نامیلکەیە، ئەوەیە لە دیاری کردنی بار و دەوری هەندێ پێشگر و پاشگر و لە تێکەڵ کردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا هەڵە دەبینرێ • بۆ وێنە ، دەربارەی پاشگری ( ین ) مامۆستا تۆسیوێتی : ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ( ناو ) و ( ئاوەڵناو ) ، وە دەیانکاتە ئاوەڵناو (بڕوانە : ل ٢٧) • تۆسەر بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەی هەندێ نموونەی هێناوەتەوە ، وەك : «ئاگرین، بەفرین، نەرمین•••» • ڕاستە وشەی «ئاگر، بەفر ••• » ناون و بە یاریدەی پاشگری (ین) دەبنە ئاوەڵناو ، بەڵام وشەی « نەرم » ئاوەڵناوە و کاتێك پاشگری ( ین )ی دەچێتە سەر دەبێتە ناو ـ واتە دەبێ بیوتایە دەچنە سەر ( ناو ) و دەیکەن بە ( ئاوەڵناو ) و بە پێچەوانەشەوە •

لە بەشی دووەمی پاشگری ناوبراودا ، تۆسەر دەڵێ : دەچێتە سەر (ئاوەڵکردار) و دەیکاتە (ناو) • نموونەکانیشی ئەمانەن : « سەرین ، پێشین، بەرین ••• » • بێ گومان وشەی « پێش » ئاوەڵکردارەو کاتێ پاشگری (ین)ی پێوە دەلکێ دەبێتە ناو • وشەی «بەر»یش ڕاستە هەر ئاوەڵکردارە، بەڵام ( ین ) نایکاتە ناو ، بەڵکو دەیکاتە ئاوەڵناو[٢] • هەرچێ وشەی «سەر»یشە لێرەدا ناوە ، نەك ئاوەڵکردار • (ین)یش هەر بە ناوێ هێشتۆیەتیەوە •

یاخود لە بەشی سێیەمی پاشگری (ە)دا تۆسیوێتی : ناو لە ئاوەڵکردار دروست دەکات ، وەك : « هاوینە ، پشتە ، زستانە ، پایزە ، بەهارە ، شەوە (بڕوانە: ل ٨)• لە تێکڕای ئەو نموونانەدا تەنیا وشەی «پشت» ئاوەڵکردارە و بە یاریدەی پاشگری (ە) بووەتە ناو • دەنا ئەوانی دیکە ناوی کات ( اسم الزمان )ن و کە پاشگری (ە)شیان پێوە دەلکێ دەبنە ئاوەڵناو ( جگە لە

---

(٢) ئەگەر « بەرین » بە مانای « پێشین» بەکار ببرێ، هەرچەندە بە دەگمەن بەو مانایە بەکاردەهێنرێ ، ئەو دەم دەبێتە ناو .

وشەی « شەوە » کەدەبێتە ناو ) . نەك ناو ، بەداخەوە ئەم جۆرە نمونانە لە نوسراوی ناوبراودا کەم‌تێن .

هـەروەها ژمارەیەك پێشـگر و پاشگر هـەن ، وەك : ( بێ ) ــ « بێهۆش ... » ؛ (بە) ــ « بەهێز ... » ؛ (نە) ــ « نەخۆش ... » ؛ (دا) ــ « دابـەزین ... » ؛ ( ڕا ) ــ «ڕاهـاتن ...» ؛ ( هـەڵ ) ــ هەڵچون ... » ؛ ( ڕۆ ) ــ « ڕۆچون ... » ؛ (وەر) ــ «وەرگێڕان..» ؛ (پێ)ــ «پێگەیشتن...» ؛ (تێ)ــ«تێ‌کردن...» ؛ (لێ)ــ «لێنان...» ؛ ( وە/ەوە ) ــ « کردنەوە ... » ؛ (اندن) ــ « ستاندن ... » ... و گەلێکی تر کە تۆماری نەکردون و لێیان نەدواوە . ئەمەش بەو بەرهەمانەدا کە مامۆستـا دواتر بڵاوی کردونەتەوە ، وا دەردەکەوێ بەشـێکیان بـە پێشگر و پاشگر دانانێ و بەشێکی دیکەشیانی لا ئاشکرا نەبووە .

هەرچەندە هەندێ کەم و کورتی تر لە کتێبـی « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا نوری عەلی ئەمیندا بەرچاو دەکەون ، بەڵام ئێمە لێرەدا نوکی قەڵەممان تەنیا لەسەر ئەو بەشەی داناوە ، کە پەیوەندی بە وشەڕۆنانەوە هەیە .

کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە بەشـی مۆرفۆلۆژی کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری »دا[٣] بە گوێرەی پێویست ، واتە لە کۆتایی باسی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا لەچۆنیەتی ڕۆنانی وشە کۆڵیونەتەوە ، بە وێنە لە کۆتایی باسی ( ناو )دا لەو پاشگرانە دواون کە نـاوی داڕێژراو ساز دەکەن ( ل ٢٨ ــ ٣٣ ) و ئەو ڕێگایانەیان دەست نیشان کردوە کە ناوی لێکدراویان پێ دروست دەکرێ (ل ٣٣ ــ ٣٧) / لە کۆتایی بەشی ئاوەڵناودا

---

(٣) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤـا ، دیـالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .

باسی ئاوەڵناوی دارێژراو ( ل ٤٠ ــ ٤١ ) و لێکدراویان ( ل ٤١ ــ ٤٣ ) کردووە • لە بەشی کرداردا هەمان شێوازیان بەکارهێناوە[٤] •

هەرچەندە مەبەستی سەرەکیی ئەم کتێبە باسی وشەڕۆنان نییە و تەنیا لە چەند شوێنێکی پێویستدا بەلای ئەو کێشەیەدا چووە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نوسەرانی لەو ڕووەوە هەندێ زانیاریی نوێ و بەکەڵکیان پێشکەش کردوە و لە گەلێك شوێنی ئەو باسەدا سەرکەوتون و ژمارەیەك نمونەی جوان و لەباریان دەربارەی وشەی دارێژراو و لێکدراو هێناوەتەوە • بەداخەوە کارەکەی ئەمانیش ، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر پوختە ، هێشتا بێ کەم و کورتی نییە :

یەکێ لەو ناتەواوییانە ، ئەوەیە کە هەندێ پێشگر و پاشگر یادداشت نەکراون • بە وێنە ، لە باسی ئەو پاشگرانەدا کە بۆ بچوك کردنەوەی ناو بەکار دەهێنرێن ، تەنیا ناوی ( لە ، ێلە ، ۆلە ، چکە ) هێنراوە (بڕوانە : ل ٣٣) • بەلام دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین ، کە لە زمانی کوردیدا جگە لەوانەی نوسەرانی کتێبی ناوبراو باسیان کردون ، ژمارەیەك پاشگری تریش هەن بۆ بچوك‌کردنەوە بەکار دەهێنرێن ، وەك : ( ڵە ) ــ « گۆزەڵە ••• » ؛ (ۆکە) ــ « بزنۆکە ••• » ؛ ( ۆلکە ) ــ « جاشۆلکە ••• » ؛ ( ۆچکە ) ــ « منداڵۆچکە ••• » ؛ (چە) ــ «باخچە •••» ؛ (ۆلە) ــ «بەرخۆلە•••» ؛ ( ۆڵ ) ــ « ئاسکۆڵ ••• » ••• وە گەلێکی تر • لەو پاشگرانەی بە ڕەگی کردارەوە یاخود ناوی چاوگ ( اسم المصدر )ەوە دەلکێن ، تەنیا ( ار ، یار، ەر ، مان)یان باس کردوە (بڕوانە : ل ٣٨ ــ ٣٩) • کەچی ئەم پاشگرانەیان : (ە) ــ « بازە•••» ؛ (گە) ــ «لەوەڕگە ••• » ؛ (اك) ــ «خۆراك•••» ؛ (کە) ــ « فڕکە ••• » ••• هتد لە یاد کردوە • هەر بەو جۆرەش هەندێ

---

(٤) کرداری دارێژراو ( ل ١٠٨ ــ ١١٨ ) ، کرداری لێکدراو ( ل ١١٩ ــ ١٢٩ ) •

شێوەی وشەی لێکدراو لە بیر کراون[٥] •

لە دیاری کردنی دەوری هەندێ پێشگر و پاشگر و لە تێکەڵکردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتنیشدا هەڵە بەدێ دەکرێ • بە وێنە وایان داناوە کە پاشگری (دار) و (باز) دەچنە سەر ناوی سادە و دەیانکەنە ناوی دارێژراو • ڕاستە ئەو دوو پاشگرە بە ناوەوە دەلکێن ، بەلام ئەوان ئەوەیان لە یاد کردوە کە هەندێ جار پاشگری ( دار ) ناوە سادەکە دەکاتە ئاوەڵناوی دارێژراو ، وەك « ناودار ، نازدار ••• » • پاشگری (باز)یش بە زۆری ناوی سادە دەکاتە ئاوەڵناوی دارێژراو، نەك ناو • وەك : «فێلباز ، کۆترباز، مێباز •••» جگە لە چەند وشەیەکی کەم کە دەبنە ناو ، وەك : « سەرباز ••• » •

جگە لەو دوو کتێبەی لە سەرەوە لێیان دواین ، لە چەند نوسراوێکی دیکەشدا کەمێك باسی وشەڕۆنان کراوە • یەك لەو نوسراوانە هەر کتێبێکی دیکەی مامۆستا نوری عەلی ئەمینە ــ « ڕێزمانی کوردی »[٦] • نوسەر لەم بەرهەمەدا لە باسی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا لە چۆنیەتی ڕۆنانی وشەی کۆڵیوەتەوە و هەندێ ئەنجامی بەکەڵکی وەدەست هێناوە ••• وا چەند کەم و کورتییەکی ئەم نوسراوەش دەخەینە ڕوو :

نوسەر وشەی دارێژراو و لێکدراوی وەك یەك تەماشا کردوە و لە یەکتری جودا نەکردونەتەوە • بە وێنە ، هەندێ ئاوەڵناوی دارێژراوی بە لێکدراو داناوە ، وەك : « نەمر ، نەبەز ، بەهێز ، بەجەرگ ، نارێك ، بێهێز ••• » • ئەو وشانەی لە ڕیزی ئاوەڵناوی لێکدراودا باس کردوە •

مامۆستا باسی ئەو پێشگرانەی نەکردوە کە کرداری دارێژراو ساز

---

(٥) دەر چەشنە نمونانە لە کتێبەکەدا نیشان دراون .
(٦) نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

دەکەن • تەنیا ئەوە نەبێ کە لە لاپەڕە ( ١٥٦ ــ ١٥٧ )دا (هــەڵ ، دا ، ڕا ، ڕۆ ••• )ی بە ئاوەڵکردار داناوە و (پێ ، تێ ، لێ )شی بە پیتی پەیوەندیێ ( حروف العطف ) داوەتە قەڵەم • ڕاستە ( پێش ، ســەر ، لا ، بەر ••• ) وەك ئاوەڵکردار و پێشــگر خۆیان دەنوێنن ، بەڵام ( هەڵ ، دا ، ڕا ، ڕۆ•••) هەر پێشگرن و هیچ دەمێك نابنە ئاوەڵکردار • هەرچێ (پێ ، تێ ، لێ)یشە پیتی پەیوەندیێ نین ، بەڵام بەر لە هەمو شتێك پێشـگرن •

هەروەها لە دیاری کردنی بــار و دەوری هەندێ پاشـگردا ناتەواوێ دەبینرێ ، بە وێنە دەربارەی پاشـگری ( ێ ، ەتێ ، ێتێ ، ایەتێ ، ایێ ) ؟ دەڵێ : ئەو پاشـگرانە « ناوی مەعنەوێ لە ناو پێ دروست ئەکرێ» (بڕوانە : ل ٧٧ ) • ڕاستە ئەو پاشـگرانە ناوی واتا لە ناو دروســـت دەکەن ، بەڵام نوسەر بۆ ئەوە نەچووە کە هەندێکیان دەچنە سەر ئاوەڵناویش و ناوی لێ دروستا دەکەن ، وەك : «بڵندێ ، سپێتێ ، بەرزایەتێ ، ڕەشایێ••• هتد» •

لە کتێبی « سەرەتاییێك لــە فیلۆلۆژی زمانی کوردیێ »ی مامۆســـتا محەمەد ئەمین هەوراماتیدا[٧] چەند باسێك بەر چاو دەکەون کە پەیوەندییان بە کێشەی وشەڕۆنانەوە هەیــە ، وەك : مۆرفیم و جۆرەکانی مۆرفیم ( ل ١٠٩ ــ ١١١) ؛ پێشــگر و پاشـگر و ناوگر (ل ١١١ ــ ١٢٥) ؛ ناوی لێکدراو (ل ١٤١ ــ ١٤٢) ؛ ناوی داتاشراو و دروست کردنی ناو لە ئاوەڵناو و لە کردار و لە ئاوەڵکردار (ل ١٥١ ــ ١٥٥) ؛ئاوەڵکرداری لێکدراو (ل ١٦٦ ــ ١٦٧ ) •

نوســـەر لە بەشی پێشـگر و پاشـــگردا ( ل ١١٢ ــ ١٢٣ ) نەك هەر نیشانەکانی بە پێشـگر و پاشـگر داناوە ، بەڵکو لەبەر باس و درێژەپێدانــی

---

(٧) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتاییێك لە فیلۆلۆژی زمــانی کوردیێ ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

ئەوان بەشێکی زۆری پێشگر و پاشگرە گرنگەکانی باس نەکردوە • جا بەو پێیە ئەمە لە سەرێکەوە بووەتە هۆی ئەوەی بە زۆر نیشانە بکرێ بە پێشگر و پاشگر و لە سەرێکی دیکەوە پێشگر و پاشگرە ڕاستەقینەکان دەرنەکەون • بە وێنە مامۆستا ( دە ــ ئــە ) ــ « دەچم ــ ئەچم ••• » ؛ (مە) ــ «مەخۆ•••» ؛ (نا) ــ «نازۆم ••• » ؛ (بم) ــ «بمفرۆشتایە•••» ؛ (ما) ــ « ماکەو ••• » ؛ ( تێرە ) ــ « تێرەورج ••• » ••• ی بە پێشگر داناوە ؛ کەچێ باسی پێشــگری ( زۆ ) ــ « زۆکردن ••• » ؛ ( وەر ) ــ «وەرچەرخاندن» ؛ (پێ) ــ «پێ گەیشتن •••» ؛ (تێ) ــ «تێ گرتن•••» ؛ (لــێ) ــ « لێــدان ••• » ؛ (وێ ) ــ « وێچــوون ••• » ؛ ( نــە ) ــ « نەخۆش ••• » •••وە گەلێــکی تری نەکردوە • یــاخود ( ەکــە ) ــ « پیاوەکە ••• » ؛ ( مان ) ــ مێژوومان بە خوێن سوورە ••• » ؛ (ن) ــ « لە خەو هەستن ••• » ؛ (تر) ــ « گەورەتر ••• »ی بە پاشگر داوەتە قەڵەم ، بەڵام گەلێك پاشگری چالاك و بەر چاوی یادداشت نەکردوە، وەك : (گــە) ــ « کــارگە ••• » ؛ ( گــەر ) ــ « ئاســنگەر ••• » ؛ ( دان ) «گوڵدان•••» ؛ ( باز ) ــ « فێڵبــاز ••• » ؛ ( ێنێ ) ــ « کوڕێنێ •••»؛ ( ۆلە ) ــ « داۆلە ••• » ؛ ( یلــە ) ــ « ئەنگوســتیلە••• » ؛ (ۆ) ــ « شێرۆ ••• » ؛ ( کە ) ــ « لەتکە ••• » ؛ ( ێنە )ــ «نیسکێنە ••• » ؛ (ێن) ــ «هەڵماێن•••» ؛ (انێ) ــ «شەڕانێ•••» ؛ (اندن) ــ «سوتاندن •••» و گەلێکی تر •

سەرەڕای ئەوە ، توسەر لە بەشی ( پاشگر )دا هەندێ وشەی واتاداری سەربەخۆی بە پاشگر ژماردوە ، وەك «خان» لە وشەی «مەحمود خان»دا ؛ «دار» لە وشەی «سپێدار»دا ، «کۆن» لە وشەی «جلەکۆن»دا •••••• جێگەی ڕەخنەیە کە مامۆستا جیاوازێ لە نێوان (نیشــانە) و (پێشــگر و پاشگر ) و ( وشە )دا دانەناوە • بە وێنە ڕاناوی لکاوی (ت)ی لە وشــەی

« گەلت » و (ەکە)ی نیشانەی ناسیاوێ لە وشەی « زمانەکە »دا ... وشەی «پیاو» لە وشەی لێکدراوی «بۆرەپیاو»دا و وشـــەی «شێر» لە وشـــەی لێکدراوی «دەمەشـــێر»دا ... پـــاشگری (چێ) لە وشـــەی داڕێژراوی «چایچێ» و پاشگری ( ستان ) لە وشەی داڕێژراوی «کوردستان»دا ... وەك یەك داناوە و لە ژێر باسی (پاشگر)دا کە ئەو زاراوی (پاشبەند)ی بۆ داناوە ، باسی کردوێن .

لە بەشی ناوگردا ( ل ١٢٤ ــ ١٢٥ ) ، ئەوەی ســـەرنج ڕابکێشـــێ ، ئەوەیە کە مامۆستا هەندی حاڵەتی کە بە هیچ جۆرێك نـــاوگر نین و لەگەڵ تەعریف و دەوری ناوگردا ناگونجێن ، بەناوگر داناوە . مامۆستا هەورامانێ (دە) لە وشەی « هەڵدەفڕێ ... » ؛ (نا) لە وشەی « هەڵنافڕێ ... » ؛ (ب) لە وشەی «دابنیشم ...» ؛ (ب) لە وشەی «دەربچوێتایە...» ؛ (نە) لە وشەی « سەرنەکەوتایە ... » ؛ ( مە ) لە وشەی « ڕامەکە ... »دا بە ناوگر دەداتە قەڵەم . بەم جۆرە ئەو شەش حاڵەتەی کردوە بە ناوگر . وا دەزانم نوســـەر لەمەشـــدا بە هـــەڵە چووە و ئەوانەی ئەو بـــە ناوگریاز تێ گەیشتووە ناوگر نین[8] . لێرەدا ئەوەش دەهێنمەوە یـــاد کە وا هەندێ نوسەری دیکەش بە هەڵە لە ناوگر تێ گەیشتوێن[9] .

هەروەها لە بەشەکانی : (ناوی لێکدراو ) و (ناوی داتـــاشراو)...ی

---

(٨) بۆ ڕوێنکردنەوە و سەلماندنی ئەم ڕایەم لە بەشی ناوگری ئەم کتێبە و لە پەراوێزی ژمارە (٣٨)دا بە دوێر و درێژێ لەو بارەیەوە دواوم .

(٩) بە وێنە د. پاکیزە ڕەفیق حیـــلمێ لە وتـــاری ( بوژاندنەوەی زمـــان «گوڤاری کوڕی زانیاری کورد» ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٦٤ - ١٦٥ )دا لە وشـەی « سوێتاندی ، خنکاندی ، جوڵاندی ، ڕوێخاندی... »دا پاشگری (اند) بە ناوگر تێ گەیشتووە . ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیە و وەلام دانەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو ڕا چەوتە دوێر لە زانستییە لە بەشی ناوگری ئەم کتێبە و لە پەراوێزی ژمارە (٣٨) دایە .

کتێبی « سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردیێ »دا گەلێك کەم و کورتیێ دەبینرێ و هەڵەی زانستیێ بەرچاو دەکەوێ .

لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد لەو لێکۆڵینەوانەیدا کە لە چەند ژمارەیەکی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »[10] و هەروەهـا بە کۆکراوەییێ لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاوی کردۆتەوە[11] ، دەبێ لەگەڵ تۆژینەوەی بەشەکانی ئاخاوتندا باسی وشەڕۆنانیش لە یاد نەکات ... لیژنە لە بەشی ناو و ئاوەڵناودا هەرچەندە تەعریفی وشەی داڕێژراو و لێکدراوی کردوە ، بەڵام لە چۆنیەتیێ و جۆری ڕۆنـانیان نەدواوە ــ واتە بـاسی ئەو پێشگر و پاشگرانەی نەکردوە کە ناو و ئاوەڵناو دروست دەکەن ؛ باسـی شێوازی پێکهاتنی ناو و ئاوەڵناوی لێکدراوی نەکردوە ... بەڵام ئەوەی سەرنج ڕابکێشیێ ئەوەیە کە لە بەشی (کردار)دا لەو پێشگر و پاشگرانەی کۆڵیوەتەوە کە کرداری داڕێژراو ساز دەکەن ؛ باسی ئەو وشانەی کردوە ، کە لە کردار وەردەگـیرێن... ئەگەر هۆی پشت‌گوێ خسـتنی بـاسی وشەڕۆنان ئەوە بێ کە لیژنە ویستبێتی بە لێکۆڵینەوەیەکی سـەربەخۆ لێی بدوێ ، ئەوە بەو پێیە دەبێ لە بەشی کرداریشدا وا بە درێژیێ لەو کێشەیە نەدوێ[12] . خۆ ئەگەر هۆیەکەی لە بیر کردن بێ ، ئەوە جێگەی ڕەخنەیە.

لیژنەی ناوبراو لە نوسراوەکەیدا بە شێوەیەکی ڕێك و پێـك تەعریفی

---

(10) بڕوانە : «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٩٨ ــ ٤٩٦ ؛ ب٣ ، ژ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٤١ ــ ٣٥٨ ؛ ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٨٩ ــ ٤٠٠ .

(11) ڕێزمانی ئاخـاوتنی کوردیێ بە پێی لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(12) لەگەڵ ئەوەشدا کە بە دوور و درێژیێ لە کرداری داڕێژراوی کۆڵیوەتەوە، کەچیێ لە وشەی لێکدراو و چەشـنەکانی نەدواوە . بێ‌گومـان ئەمەش کەم و کورتییەکی تری باسەکەیە .

وشەی دارێژراو و لێکدراوی کردوە و سنوری تەواوی لە نێوانیاندا کێشاوە و لە هیچ شوێنێکی باسەکەیدا تێکەڵی نەکردون[١٣] ... لە بەشی (کردار)دا بە شێوەیەکی زانستی و بە نمونەی جوان و لە بارەوە باسی ئەو پێشگرە سادانەی کردوە کە کرداری دارێژراو زۆردەتێن و دەوری هەر یەکێکیانی دیاری کردوە . بەڵام بەداخەوە لیژنەی ناوبراو پێشگری (ڕۆ) و (ڕێ)ی کە ئەمانیش لە ڕۆنانی کرداری دارێژراودا دەورێکی گرنگ دەبینن . لە یاد کردوە و بە هیچ جۆرێك ناوی نەهێناون . جگە لەوە دەربارەی پێشگرە ناسادەکان ، وەك : ( پێدا ، تێدا ، پێوە ، تێوە ، پێڕا ، پێك . تێك ، لێك ... هتد ) هیچی نەنوسیوە .

هەرچەندە لیژنەی « زمان و زانستەکانی » کۆڕ لە بەشی کرداری دارێژراودا نیشانەکانی وەك پێشگر و پاشگر نەژماردوە ، بەڵامئەوەی جێی سەرسوڕمان بێ ، ئەوەیە لەو نمونانەدا کە بۆ تەعریفی ئاوەڵناوی دارێژراو هێنراونەتەوە نیشانەی ( ەم ) ــ «هەشتەم» ؛ (ەمین) ــ «هەشتەمین» ؛ ( تر ) ــ «گەورەتر» ؛ (ترین) ــ « گەورەترین » نەك هەر بە پاشگر دراونەتە قەڵەم ، بەڵکو بە پاشگری دارێژەریش دانراون ( بڕوانە : ل ٨٢ ).

چەند لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆش دەربارەی هەندێ پێشگر و پاشگر بڵاوکراونەتەوە ، کە لە ناویاندا ئەوانەی د. نەسرین فەخری و د. فاروق عومەر صدیق دیارن .

د. نەسرین فەخری لە بارەی پێشگر و پاشگری (وە/ەوە)وە لە ژێر ناوی «پاشگر و پێشگری (ڤە ــ یان ــ وە) لە زمانی کوردیدا» وتارێکی

---

(١٣) بەداخەوە بەشێکی زۆر لە زمانناسانی کورد ئەو دوو جۆرە وشەیەیان تێکەڵی یەك کردوە .

بڵاوکردۆتەوە[١٤] و تیایدا بە درێژی و بەڵگەوە لە واتا و دەور و پێکهاتنی دواوە • بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج بێ ئەوەیە ، نوسەر لەو ڕایەدایە کە ئەم پاشگرە تەنیا شێوەی (وە)ی هەیە • بەڵگەشی ئەوەیە کە لە شێوەی کرمانجی ژوروودا کاتێك دەبێتە پێشگر (ڤە) بەکار دێت • وە بزوێنی (ە)ش بە پیتێکی پەیوەندی دادەنێ • بە ڕای من ئەو تەنیا بەڵگەیەی د• نەسرین فەخری زۆر کەمە بۆ ئەوەی ، ئەو پاشگرە بە ( وە ) دابنرێ ، بەتایبەتی چونکە بەڵگەی بەهێز هەن (ئەو بەڵگانە لە پەراوێزی ژمارە ٨٦دا بە درێژی باس کراون ) ، ئەوە بسەلمێنن کە ئەو پاشگرە دەبێ ( ەوە ) بێ ، نەك (وە) و بەو پێیە بزوێنی (ە) دەبێ ڕەسەن بێ ، نەك بۆ پەیوەندی ••• جگە لەو بەرهەمە، نوسەری ناوبراو دەربارەی پاشگری (اندن)یش وتارێکی بڵاوکردۆتەوە[١٥] •

مامۆستا فاروق عومەر صدیق بە ناونیشانی « وشەسازی لە زمانی کوردیدا » وتارێکی بڵاوکردۆتەوە[١٦] و تیایدا لە پاشگری (ی)ی ناوی مەعنا و (ی) ی سیفەی نیسبی دواوە و بە دوور و درێژی لە پەیدابون و گەشەکردنیانی کۆڵیوەتەوە ــ واتە باسی ئەو پاشگرانەی لە زمانی فارسی ناوەڕاست و تازەدا کردوە و لەگەڵ کوردیدا بەراوردی کردون • دەوریانی لە گەیاندنی مانا و مەبەست ، لە داڕشتنی وشەدا ••• نیشان داوە • هەرچەندە نوسەر لە چەند شوێنێکی وتارەکەیدا بە هەڵەدا چووە ( کە

---

(١٤) د. نەسرین فەخری ، پاشگر و پێشگری ( ڤە ــ یان ــ وە ) لە زمانی کوردیدا ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٤١٧ ــ ٥٢٣ .

(١٥) د. نەسرین فەخری ، پاشگری (اندن) لە زمانی کوردیدا ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ ــ ٢٤٢ .

(١٦) فاروق عومەر صدیق ، وشەسازی لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٣ ، ژ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤١٧ ــ ٥٢٣ .

نرخێنەر مامۆستا مەسعود محەمەد بەشێکی زۆریانی لەگەڵ وتارەکەدا چاپ کردوە ) ، بەڵام بەگشتێ هەندێ زانیارێ نوێی لە بارەی ئەو دۆ پاشگرەوە تۆمار کردوە •

مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لەو کتێبەیدا کە چەند مانگێك لەمەوبەر بڵاوی کردۆتەوە[17] شتێکی ئەوتۆی لە بارەی وشەڕۆنانەوە نەتوسیوە ••• ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ تەنیا باسی : ئاوەڵناوی لێکدراو ( ل ١٣٨ ــ ١٤٨ ) و کردنی ئاوەڵناو بە ناو (ل ١٤٨ ــ ١٥١ )ە •

لە بەشی ئاوەڵناوی لێکدراودا هەرچەندە هەندێ نمونەی جوانی بۆ چەشنە جوداوازەکانی وشەی لێکدراو هێناوەتەوە ، بەڵام بەداخەوە تێکەڵ کردنێکی تەواو بەرچاو دەکەوێ • توسەر بەر لە هەمو شتێك ئاوەڵناوی داڕێژراو و لێکدراوی بە یەك شت داناوە و لە یەك جودای نەکردۆتەوە ، ئەمەش هەڵەیەکی بنەڕەتێ باسەکەیەتی کەهەر لە سەرەتاوە بە ڕێگەیەکی چەوتدا ڕۆیشتووە • بێ گومان ئەمەش کەم و کورتییەکی گەورەیە ••• سەرەڕاری ئەوە کە مامۆستا ئاوەڵناوی داڕێژراو و لێکدراوی بە ئاوەڵناوی لێکدراو داناوە ، ئنجا گەلێ پێشگر و پاشگر و چەشنی جوراوجۆری ئاوەڵناوی یادداشت نەکردوە[18] •

جگە لەوە مامۆستا لە دیارێ کردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا هەڵەی کردوە • بە وێنە وای نیشان داوە ، کە وشەی « زۆرخۆر » لە دو ئاوەڵناو پێکهاتووە ( بڕوانە : ل ١٣٩ ) • ڕاستە « زۆر » ئاوەڵناوە ، بەڵام « خۆر » ئاوەڵناو نییە و ڕەگی کردارە • بەم چەشنە « زۆرخۆر » لە دۆ ئاوەڵناو پێك نەهاتوە ، بەڵکو لە ئاوەڵناوێك و ڕەگی کردار دروست بووە•

---

(١٧) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردێ ، بەغدا ، ١٩٧٦ •
(١٨) بڕوانە ئەو باسەی لەم کتێبەدا دەربارەی ئاوەڵناوی داڕێژراو و لێکدراو کراوە •

کێشەی کردنی ئاوەڵناو بە ناو کە مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە ژێر ناوی : « چۆن ئاوەڵناو ئەکەین بـە ناو »دا (ل ١٤٨ ــ ١٥١ ) لێی دواوە زۆر کورت و کۆڵە و وای بۆ چووە کە تەنیا پاشگری ( یَ ، ایەتیَ ، یَتیَ ) ئاوەڵناو دەکەنە ناو ••• بەداخەوە وەك خۆی بـە بیریا نەهاتووە ، سەرچاوەی کوردیشی بۆ تەماشـا نەکردوە • دەنا لە مێژە مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە کتێبی « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردیَ »دا ژمارەیەك پاشگری دەست نیشـانکردوە کە ئاوەڵناو دەکەنە نـاو ، وەك : (ە) ــ « خراپە ••• » ؛ (ێنە ) ــ « زەردێنـە » ؛ (کە) ــ « ڕەشکە » ••• وە گەلێکی تر کە لە ژێر سەرباسی « ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو »دا لەم کتێبەماندا لێیان دواوین •

عەمید ئەحمەد حەسـەن لەو وتارەشـیدا کە بە ناوی « پێشـگر و پاشگرە »ەوە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوی کردۆتەوە[19] ، لەوەشدا تووشی هەڵەیەکی گەورە بووە کە ( شیَ ، گل ، فێر ، فریا ، نقوم ، پیشان ، قوت ، یەك ، پـەیدا ، بەرپا ، گلۆر ، تێپەڕ ••• )ی بە پێشگر داناوە • بێ‌گومان ئەوانە ناتوانرێ بە پێشـگر دابنرێن ، بەڵکو وشەن ، هەرچەندە زۆریان مانای سەربەخۆی خۆیان نییە و سەربەخۆ بەکار نایەن•

لە هەندێ لەو کتێب و وتارانەدا کە مامۆستـایان : قەناتی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسـیویانە چاومان بە باسی وشەڕۆنان دەکەوێ • بە وێنە مامۆستا قەناتی کوردۆ لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردیَ »دا[20] لە لاپەڕە ٢٩٣ ــ ٢٩٩دا لە وشەڕۆنانی کۆڵیوەتەوە•

---

(١٩) عەمید ئەحمەد حەسەن ، پێشگر و پاشگر ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٢٢ ــ ٣٢٣ .

(٢٠) قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، دەستووری زمـانی کـوردیَ ، مـۆسکۆ ــ لێنینگراد ، ١٩٥٧ ( بە زمانی ڕۆسیَ ) .

هەرچەندە نوسەر بە چەند لاپەڕەیەکی کەم لەو باسە دواوە و هەمو لایەنێکی ڕۆن نەکردۆتەوە ، بەڵام گرنگی لەوەدایە کە وەك فەسلێکی تایبەتی جودای کردۆتەوە • سەرەڕای ئەوە مامۆستا لە باسی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا ناو ناوە لە ڕۆنانیان دواوە[٢١] لـە لاپەڕە ( ١٦ ــ ١٩ )ی کتێبی « زمانی کوردی »شدا[٢٢] کەمێك لە وشەی داڕێژراو و لێکدراو دواوە و شێوازی دروست بونیانی باس کردوە ••• جگە لەوەی لە سـەرەوە لێی دواین ، هەروەها مامۆستا کوردۆ هەندێ وتاری بەنرخی لەو ڕووەوە بڵاوکردۆتەوە: « ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا »[٢٣] و « دەربارەی دو بنچینەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا »[٢٤] ••• هتد •

مامۆسـتا چـەرکەزی بـەکو لە کتێبی « زمـانی کوردەکـانی ئازربـایجان[٢٥] (ل ٩٠ ــ ٩٦) و « زمـانی کوردەکانی سـوڤێت »[٢٦] (ل٢٣٩ــ٢٧٢)دا ••• لە کێشەی ڕۆنانی وشەی کولیوەتەوەوە بەتایبەتی لە کتێبی دووەمدا بە شێوەیەکی فراوان لەو باسە دواوە و بە نمونەی جوان و لەبار هەندێ ڕوی ئەو زانستەی ئاشکرا کردوە •

---

(٢١) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ١٣٦ ؛ ١٦٢ ــ ١٩٢ ؛ ٢٧١ ــ ٢٧٤ • •

(٢٢) قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، زمانی کوردی ، مۆسکو ، ١٩٦١ ( بە زمانی ڕوسی ) •

(٢٣) قەنـاتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، ڕۆنـانی وشـە لە زمـانی کوردیـدا ، «ڕێزمان و مێژوی زمانەکانی ڕۆژهـەڵات » ، لینینگـراد ، ١٩٥٨ ، ل ١٠٩ ــ ١٤٢ ( بە زمانی ڕوسی ) •

(٢٤) قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، دو بنچینەی ڕۆنانی وشـە لە زمانی کوردیدا، «کورتەی دەنگوبـاسی ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتنـاسی » ، ١٩٥٩ ، ب ٢٩ ( بە زمانی ڕوسی ) •

(٢٥) چەرکەزی بەکو (باکاییێف) ، زمانی کوردەکانی ئازربـایجان ، مۆسـکو ، ١٩٦٥ •

(٢٦) چەرکەزی بەکو ( باکاییێف) ، زمانی کوردەکانی سوڤێت ، مۆسکو، ١٩٧٣•

شایانی باســه هەردوو مامۆستا لــە لێکۆڵینەوەی زماندا کێشــەی وشەڕۆنانیان ڕەچاو کردوە و بەو کارانەیان گەلێك باسی ڕۆنانی وشەیان لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا ساغ کردۆتەوە ٠

تێکڕای ئەو نووسراوانەی لە سەرەوە لێیان دواین و هەندێکی دیکەش تا ڕادەیەك لە هەندێ کێشەی وشەڕۆنانی زمــانی کوردیی دواون ٠ بەڵام بەداخەوە نەك هەر کەم و کورتی و ناتەواوییان زۆر تێدایە ، بەڵکو بەلای زۆر کێشەشیدا نەچوون٠٠٠ بێ گومان ئەمەش کەلێنێکی گەورەیە لە کاری لێکۆڵینەوەی زمانەکەماندا ٠ بینینی ئەو کەلێنە هەستی بزواندم و ڕایکێشام کە خۆم بەو باســەوە خەریــك بکەم ٠٠٠ دوای هــەوڵ و کۆششــێکی زۆر ، ئــەوەی بۆم کرا کردم و ئــەوەی لە توانــامدا بوو بە جێــم هێنا٠٠٠ نیمچــە شــارەزاییەك لــە مەســەلەی وشــەڕۆنان و هەڵســەنگاندنی ئــەوەی هــەر لــە زووەوە تــاکو ئــەمڕۆ لــە بــارەی وشـــەڕۆنانی زمانی کوردییەوە نووســراوە ، چوونە ناو زمانەکە خۆیەوە و لێکدانەوە و شوێن کەوتنی ٠٠٠ ئەو ڕێگەیەیان بــۆ خۆش کردم کە ئەوەی دەربارەی وشەڕۆنانی زمانەکەمان ڕاست و زانستییانە نووسرابێ بسەلمێنم و بچەسپێنم، ئەوەی هەڵە و چەوتیش بێ لای بــەرم و دووری بخەمەوە(٣٧) ٠٠٠ هیــچ گومــانم لەوەدا نییــە ، کە ئەم کارەی منیــش پێشکەش بــە نەتــەوە خۆشەویستەکەمی دەکەم ، کارێکی تەواو نییە و کەم و کورتی تێدا هەیە ٠ بەڵام ئەوەندەش هەیە ، ئەم کتێبە سەرەتایەکە لە بارەی کێشەی وشەڕۆنانی کوردییەوە و گەلێك کەرەســتەی نوێی وەهای تێدایە ، کە تا ئێســتا لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا باسیان نەکراوە ٠

---

(٣٧) بەداخەوە لە بەشــی هەرە زۆری ئــەو لێکۆڵینەوانــەدا کە دەربــارەی وشەڕۆنانی زمانی کوردیی نووسراون، هەڵە و ناتەواوی ئێجگار زۆر بەرچاو دەکەون . بۆیەکا ئێمەش لە گەلێك پەراوێزی ئەم کتێبەدا بایەخمان بــە ڕەتکردنەوەیان داوە .

ئەرکی سەرەکی ئەم کتێبە « وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا » ، تۆژینەوە و کۆلینەوەیە لەو کێشە گرنگانەی لە ڕوی وشەڕۆنانەوە پەیوەندییان بە وشەی کوردییەوە هەیە ، بەتایبەتی وەك : ( مۆرفێم ، جۆرەکانی مۆرفێم ، شێوەی مۆرفێم ، پێشگر و پاشگر و نیشانە ، ئینتەرفیکس ، کۆنفیکس ، ناوگر ، وشەی داڕێژراو ـ ناوی داڕێژراو ، ئاوەڵناوی داڕێژراو ، کرداری داڕێژراو ، ئاوەلکرداری داڕێژراو ؛ وشەی لێکدراو ـ ناوی لێکدراو ، ئاوەڵناوی لێکدراو ، کرداری لێکدراو ، ئاوەلکرداری لێکدراو ... ) .

لە ناخی دڵەوە سوپاسی مامۆستا مەسعود محەمەد دەکەم ، کە لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی گەلێك ڕوی ئەم باسەدا ، گەلێك هاریکاری لەگەڵ کردم .

شایانی باسە مامۆستایان : عەبدوڵڵا حەسەن زادە و شوکور مستەفا و محەمەدی مەلا کەریم لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا زۆریان یاریدەدام . هەروەها ڕێز و سوپاسم بۆ کرێکاران و لێپرسراوی چاپخانەی کۆڕ ، کە بەڕاستی دڵسۆزانە ئەم کارەیان بۆ هەڵسوڕاندم .

مایەی بەختەوەریم دەبێ و هیوا و ئاواتێکی گەورەم دێتە دێ ، ئەگەر توانیبێتم بەم کارە خزمەتێکی بچوك پێشکەش بە زانیاری گەلەکەمان بکەم و لە بارەی وشەڕۆنانی زمانی کوردییەوە چەند وشەیەکی بە کەلك بنوسم .

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

# وشەڕۆنـــان

( Word — formation — بنــاء الكلمة )

وشەڕۆنان لە زانســـتی زمـــاندا بەو بەشـــە دەڵێن ، کە لە چۆنیەتی پێکهاتن و یاسای دروست بونی وشەکانی ئەمڕۆی زمان دەکۆڵێتەوە •

هەر وەك کەرەستەی لێکسیکۆلۆژی ـ بریتییە لە وشە ، هەروەها وشەڕۆنان ( Word — formation )یش هەر لە وشە دەدوێ ، بەڵام لێرەدا لە ڕۆی مانا و واتاوە لێی ناکۆڵێتەوە ، بەڵکو کاری پێویســـت و گرنگ نیشاندانی چۆنیەتی پێـــکهاتن و دروســـت بونی وشـــە و دیاری کردنی پارچەکانێتی • بۆ نمونە ، ئەگەر لە باری وشـــەڕۆنانەوە تەماشای وشەی « کوردستان » بکەین ، دەبینین لە وشەی « کورد » و پاشگری ( ستان ) پێکهاتووە • بەم جۆرە لە وشـــەی « کوردستان »دا دو پارچەی واتادار هەیە ، کە هەر پارچەیەکیان دەکرێ لەگەڵ پارچەی تردا بەکار بهێنرێ• بۆ نمونە : «کوردایەتی، کوردپەروەر•••» ؛ «گۆڕستان، ئەرمەنستان•••»• لێرەدا جگە لە نیشاندانی شـــێوەی دروست بونی وشە ، پێویســـتە مانای ئەو پارچە جودا جودا واتادار ( مۆرفێم )انەش کە وشەکە پێكدەهێنن ، دەستنیشان بکرێت : « کورد »ـ ناوی میللەتێکە ؛ ( ستان ) ـ لە زمانی کوردیدا پاشگرێکە شوێن و جێگە نیشـــان دەدات ••• بەم شـــێوەیە کە پاشگری ( ستان ) دەچێتە سەر وشەی « کورد » ، وشەی « کوردستان » پەیدا دەبێ و مانای ( مەڵبەندی کوردان ) بە دەستەوە دەدا •

یاخود ئەگەر لە وشەی « دارتاش » وردبینەوە ، دەبینین لە « دار + تاش » دروست بووە • لێرەدا دوو پارچەی واتادار یەکیان گرتووە و وشەیەکی نوێیان پێکهێناوە • هەر پارچەیەك لەو پارچە واتادارانە دەتوانێ بچێتە پاڵ وشەی دیکە ، وەك «سەرتاش ، بەردتاش•••» ؛ « دارفرۆش ، دارگوێز ••• » • ئەگەر لەو پارچە واتـادار ( مۆرفێم )انە بڕوانین کـە وشەکەیان پێکهێناوە ، دەبینین : « دار » ـــ ( درەخت و لقی درەخت و ئەو کەرەستە خاوەی لە درەخت دێتـە بەرهەم ) ، « تاش » ـــ ڕەگی کرداری « تاشین »ە ، بە مانای ( ڕێكخسـتن و لوس‌کردنی شـتێك ) دێت • بەم شێوەیە کە « تاش » بە وشەی « دار »ەوە دەلکێ ، ئەو دەمە « دارتاش » دروست دەبێ و ماناکەی مەبەست ( وەستایەکە لە دار و تەختە شت دروست بکا ) •

# مۆرفێم

( المورفيـم — Morpheme )

لێکۆڵینەوە دەربارەی هەندێ دانەی زمان زۆرە و تەنانەت لە زانستی زماندا بەشی سەربەخۆیان بۆ دانراوە ••• بـەڵام بەداخەوە گرنگییەکی ئەوتۆ بە کێشەی مۆرفێم نەدراوە • نەبوونی لێکۆڵینەوەی تایبەتی و تێر و تەسەل سەبارەت بە کێشەی مۆرفێم بووەتە هۆی دواکەوتنی لێکدانەوەی هەندێ کێشەی تیۆریی زمانناسی • زۆر جاریش کاری کردۆتە سەر ئەوەی ئەنجامی سەرکەوتوو وەدەست نەهێنرێ •

ئەگەر چاوێك بەو نووسراوانـەدا بخشـێنین ، کە دەربارەی زمـانی کوردیی نووسراون ، بە ئاشکرا دەبینین کەم یا زۆر باسـی گەلێك کێشەی زمان‌کراوە ، بەڵام ئەوەی باسـی لێوە نەکرابێ ( تەنها بـە چەند دێڕێك

نەبێ )[1] کێشەی مۆرفێمە لە زمانی کوردیدا ••• ئەمەش وەنەبێ شتێکی ڕێکەوت بێ ، بەڵکو تەنانەت بە نیسبەت زمانە پێشکەوتووەکانیشەوە لەم بارەیەوە توێژینــەوە کەمە و هێشـــتا گەلێ ڕووی ئەم باســـە بەر ڕوناکی لێکۆڵینەوە نەکەوتووە •

تیۆری مۆرفێم لە زمانناسی ئەم سەردەمەدا کەم لێیکۆڵراوەتەوە و باسی سەربەخۆ و تێر و تەسەل دەربارەی نییە • باسی تیۆری مۆرفێم بە زۆری لە هەندێ لێکۆڵینەوەی گشـــتی زمانناسیدا بـــەر چاو دەکەوێ و بەتایبەتی لە باسی وشەڕۆناندا •

هەرچەندە ژمارەیەك لە زانایان لە بارەی مۆرفێمەوە دواون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاکو ئێستا تەعریفێکی تەواوی پڕ بە پڕی مۆرفێم نییە ؛ جۆرەکانی بە باشی دیاری نەکراون ؛ مانای جۆرە جیـــاوازەکانی ئاشکرا نەکراوە ؛ دەور و ئەرکیان لە زماندا نیشان نەدراوە[2] •

دەربارەی تەعریفی مۆرفێم ڕای جیـــاواز زۆرە و ژمارەیەك تەعریف هەن کە وێك ناچن و هەندێکیان کەم و کورتییان تێدا دەبینرێ ••• ئەو تەعریفەی لـــە هەموان تەواوتر و لەبـــارتر و باوترە ، ئـــەوەیە کە دەڵێ : مۆرفێم ـ بچوکترین دانەی واتاداری زمانە[3] •

---

(1) مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامـــانی ، لە کتێبـــی « سەرەتـــایێك لە فیلۆلۆژی زمـــانی کوردی »دا ، بەغـــدا ، ١٩٧٣ ، کەمێـــك لە بـــارەی مۆرفێمەوە دواوە ( ل ١٠٩ ـ ١١١ ) •

(2) ر. ئا. بوداگوف ، سەرەتایێك بۆ چوونە ناو زانستی زمانەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٥٨ ، ل ٢٣ •

(3) مەبەست لە مۆرفێم ـ بچوکترین دانەی واتادار ، ئەوەیە کە نـــاتوانرێ بچوکتر بکرێتەوە بە مەرجێ واتای نەفەوتێ. بە وێنە وشەی «مۆمدان»، لە دوو مۆرفێم : « مۆم + دان » دروســـت بووە و هـــەر یەکێك لـــەو مۆرفێمانە بچوکترین پارچەی واتاداری ئەو وشـەیەن و ناکرێ بچوکتر بکرێنەوە و ماناش ببەخشن . بێ گومان ئەگەر یەك دەنگیان لێ لابرێ ، =

ئەوەی لــەم ڕووەوە پتر لێی کۆڵراوەتەوە مۆرفێمە ئافیکسیەکانن ، کە ئەمانیش لە زماندا دوو دەوری گرنگ دەبینن :

یەکەم ــ ڕۆنانی وشە • ئەم کارەش ( پێشــگر و پاشــگر ) بەجێی دەهێنن •

دووەم ــ گۆڕینی ڕێژەی وشە ، کە ( نیشانە )[٤] سازی دەکا •

مۆرفێم یەکێکە لــەو هۆیانە کە حاڵەتی ڕێزمانی لــە مۆرفۆلۆژی و هەروەها لە سینتاکسدا پێك دێنێ • لە زمانی کوردیدا کە حاڵەتی ڕێزمانی زۆرە ، مۆرفێمە هەمەچەشنەکانی هۆیەکی هەرە کاریگەر و ناســراون لــە پێکهێنان و دەربڕینی ئەو حاڵەتە ڕێزمانیانەدا • لە زمانی ئینگلیزیدا دەوری مۆرفێم بۆ ســازکردنی حاڵەتی ڕێزمانی تا ڕادەیەك کەمە ، بــەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیشانەی وەها هەیە، کە ڕێژەی وشە دەگۆڕێ ، وەك : (( s(es) )) نیشــانەی کــۆی نــاو ( book — books, box — boxes ) ; (( er )) — نیشانەی پلەی بەراوردی ئاوەڵنــاو ( long — longer ) .... هتد[٥] •

بەڵام دەربڕینی حاڵەتی ڕێزمانی تــاکە دەوری مۆرفێم نییە ، بەڵکو دەورێکی دیکەی زۆر گرنگی هەیە ، کە ئەویش ڕۆنانی وشەیە •

ئاخاوتنی ئێمە بەر لە هەمو شتێك بریتییە لە ڕستە • هەر ڕستەیەکیش کەم یا زۆر خاوەنی مانای خۆیەتی••• ڕستەش بە سەر فرێزدا دابەش دەبێ•

---

=

بێواتا دەبن و ناتوانرێ پێیان بوترێ مۆرفێم ... هەروەهــا وشــەی « پەرێ » بریتییە لە یەك مۆرفێم یاخود دوو کەرت یاخود چوار فۆنێم. لێرەدا « پەرێ » بچوکترین دانەی واتادارە و لەوە بچوکتر ناکرێتەوە ، بە مەرجێك واتای ون نەبێ . ئەگەر ، بکرێتە « پە ، ڕێ ... » واتای نامێنێ ، کە واتاش نەما بە مۆرفێم نازمێررێت .

(٤) لەم کتێبەدا بە شێوەیەکی فراوان پێشگر و پاشــگر و نیشــانە شــی کراونەتەوە .

(٥) گ. س. کاچکینا، کێشــەی واتای مۆرفێم ، لێنینگراد، ١٩٦٣، ل ١٤.

فرێزیش وشەی لێ دەبێتەوە • وشــەش لە مۆرفێم پێکهاتووە • هەرچی مۆرفێمە لە ڕووی واتاوە بەسەر پارچەی لە خۆ بچوکتردا دابەش نابێ • وشە لە ســەرێکیترەوە ، بێ ئەوەی پەیوەندیّ بــە مۆرفێمەوە هەبێت بەسەر کەرتدا دابەش دەبێ • لە کۆتاییشدا دەکرێ کەرت دەنگ ، یاخود فۆنێمی لێ جودا بکرێتەوە •

ئەو دابەش کردنەی دانەکانی زمان کە لە سەرەوە باســمان لێکرد ، دەتوانرێ لە شێوەی ئەو نەخشـەیەی خوارەوەدا نیشان بدرێ •



ئەوەی لەو نەخشەیەی سەرەوەدا نیشان دراوە ، دانە سەرەکییەکانی زمانن ... بەڵام ئەوەی لەم ڕووەوە سەرنج ڕابکێشێ ، ئەوەیە کە زانایان لەوەدا ڕای جیاوازیان هەیە ، کـە ئایا کامەیان لـە هەمویان گرنگتر و سەرەکیتره . هەندێ لە زمانناسان لەو ڕایەدان کە « لە ناو دانەکانی زماندا ڕستە و وشە بایەخیان لە هەموان زیـاتر هەیـە و وەسـیلەی ئاخـاوتن و ئالوگۆڕکردنی بیر و باوەڕ و لە یەکتر گەیشتنی ئەندامانی کۆمەڵن »[٦] .

ئۆ . س . ئاخمانۆڤا و ن . م . شانسـکی وای دادەنێن کە تەنیا وشە دانەی هەرە سەرەکی زمـانە ... کەچـی ت . پ . لۆمتێـف هەوڵی داوە بیچەسپێنێ کە گرنگی ڕستە لە هی وشە کەمتر نییە[٧] .

لەم بارەیەوە گ . س . کاچکینا تۆسیوێتی دەڵێ : دانانی تەنیا وشە بە دانەی سەرەکی زمان بۆتە هۆی ئەوەی کێشەی واتـای دانەکـانی دیکەی زمان ، بەتایبەتی مۆرفێم ، بە باشی لە زمانناسیدا سـاغ نەکرێتەوە ... ئەو جۆرە دانانەی زمان ، وەك : وشە و ڕستە ، ئەرکێکی کۆمەڵایەتی زمـان بەجێ دەهێنن ــ واتـە دەوری زمـانەوانی جێبەجـێ نـاکەن . بەڵام بۆ تێگەیشتنی پێکهاتنی زمان ، بۆ لێکۆڵینەوەی تەواو لەزمان ، بۆ لێکدانەوەی ڕێزمانەکەی ، بۆ شیکردنەوەی ڕۆنانی وشەکانی ... مۆرفێم لە وشە و ڕستە کەمتر نییە و دیوی ناوەوەی زمانناسی ئاشکرا دەکا[٨].

لێکۆڵینـەوەی تەواو لە گشـت ڕۆیەکی مۆرفێـم ، بەتـایبەتی بۆ مۆرفۆلۆژی بایەخی هەیە . ئەو دەسـتورانەی وشـەیان پێدەگۆڕرێ و

---

(٦) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت ، ڕێزمـانی زمانی ڕۆسـی ، بەرگ ٢١ مۆسکۆ ، ١٩٥٣ ، ل ١٢ .

(٧) گ . س . کاچکینا ، کێشەی واتای مۆرفێـم ، لێنینـگراد ، ١٩٦٣ ، ل ٢١ .

(٨) هەمان سەرچاوە ، ل ٢١ ــ ٢٢ .

هەروەها وشەی نوێیان پێ پێكدەهێنرێ بە یارمەتی مۆرفیمی تایبەتی ساز دەبن •

ئەگەر تەماشای وشەكانی زمانی كوردی بكەین ، دەبینین بەشێكی زۆریان لە پارچەی جودا جودای واتادار ( مۆرفیم ) دروست بوون • ئەو پارچە واتادارانەی وشە پێكدەهێنن ، پەیوەندییان لەگەڵ یەكتردا هەیە و مانا و دەستوری وشەكە بەوانەوە بەندە • بۆ نمونە ، ئەگەر وشەی «گۆزەڵە» بەرانبەر بە «گۆزە» ڕاگرین ، دەبینین لە دوو پارچە پێكهاتووە:

«گۆزە» ــ دەفرێكی گەورەی گڵینی دەسكداری سورەوە كراوە ، ئاوی تێ دەكرێ •

« ڵە » ــ نیشانەی بچوكی بارستە •

سەرپاكی ئەو دوو پارچەیە ــ واتە «گۆزەڵە» مانای (گۆزەی بچوك) دەگەیەنێ • ئەو پارچە واتادارانەی وشە لە زانستی زماندا (مۆرفیم)یان پێ دەوترێ • مۆرفیم ــ بچوكترین دانەی واتاداری زمانە و ئەركی ڕێزمانی هەیە • بەتایبەتی ئەو واتادارییە لە (فۆنیم)ی جودا دەكاتەوە • هەرچی فۆنیمە ــ كاری جیاكردنەوە و گۆڕینی مانای وشە بەجێ دەهێنێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بە تەنیا خاوەنی مانا و واتا نییە • بە وێنە ، ئەگەر فۆنیمی ( ا ) لە وشەی « باز »دا بگۆڕێت بە ( ە ، ۆ ، ێ ••• ) ئەوە ئەم وشانە « بەز ، بۆز ، بێز •••» پەیدا دەبن ، كە جیاوازییەكی تەواو لە مانایاندا هەیە ــ واتە لێرەدا فۆنیمی ( ە ، ۆ ، ێ••• ) دەوری گۆڕینی مانای وشەی «باز» دەبینن[٩] •

---

(٩) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو لە بارەی فۆنیمەوە ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، زمانی كوردی لە بەر ڕۆشنایی فۆنەتیكدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٥ ــ ١٦ •

پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە دەکرێ مۆرفێم لە یەك دەنگ پێك بێ ، وەك ( ە ) لە وشەی «ڕاستە»دا ؛ (ێ) لە وشەی «کوردێ»دا ؛ ( ا ) لە وشەی «زانا» ... هتد

دەشکرێ وشە لە یەك مۆرفێم پێکهاتبێ ، وەك : چاو ، لووت ، پێ ، سەر ، ئاش ، ئاو ، ڕاو ، ژن ، کچ ...هتد . هەروەها وشەش هەیە کە لە دوو مۆرفێم یان پتر دروست بووە ، وەك :

ئاسنگەر = ئاسن + گەر
فێلباز = فێڵ + باز
هەڵچوون = هەڵ + چوون
نەخۆش = نە + خۆش
داگرتنەوە = دا + گرتن + ەوە
تێهەڵسوون = تێ + هەڵ + سوون
.... و گەلێکی تر .

پێویستی ژیانی کۆمەڵ ، زیاد بوونی بەرهەم ، پێشکەوتنی بیر و فکری مرۆڤ ... هەمیشە پێویستییان بە پەیدابوون و هاتنە کایەی وشەی نوێ هەیە . وشەکانی زمان زیاد دەبن و گەشە دەکەن و گۆڕانیان بە سەرا دێ . لە زماندا بزووتنەوەی بێوچان و بەردەوامی دروست بوونی وشەی نوێ هەیە و لە سەر بنچینەی ئەو وشانەی لە زووەوە لە زماندا هەن ، وشەی نوێ دروست دەبێ .

کەرت کردنی وشە بەسەر مۆرفێمدا یاریدەی ڕۆنانی وشەی نوێ دەدات . زۆر جار وشەی نوێ لە مۆرفێمە چالاکەکانی زمان دروست دەکرێن و ئەمەش سەرچاوەیەکی گرنگی تەواو کردن و دەوڵەمەند کردنی زمانە . ڕۆنانی وشەی نوێ لە مۆرفێمە چالاکەکان ، بەتایبەتی لە وشەی

نوێباو (الكلمات المولدة ــ Neologism)دا[10] بەدی دەکرێ و ئەمــە ، ئەوە ئاشكرا دەكا كە زوربەی ئەو وشانەی لە زووەوە لە زماندا هەبوون هەر بەو چەشنە پێکهاتوون • ئەگەر تەماشای ئەو زاراوانە بکەین کە لەم سالانەی دواییدا داڕێژراون ، ئەوە پتر ئەو ڕاستییە دەسەلمێنین • بە وێنــە مۆرفێمی (دان) لە تێکڕای ئەو وشە کوردییانەدا کە هــەر لە زووەوە بەســەر زاری خەلکەکەوەن ، چووەتە سەر ناو و واتای شوێن و جێگەی گەیـاندووە • دەبینین لە وشەی «ئاگردان» و «مۆمدان» و «گولـدان»•••دا مۆرفێمی (دان) چووەتە سەر وشەکانی «ئــاگر» و «مۆم» و «گوڵ»••• و واتــای شوێن و جێگەیانی نیشان داوە • جا هەر لەسەر ئەو دەستورە لەم چەندانەی دواییدا بە یاریدەی مۆرفیمی (دان) وشەی «سەهۆڵدان»[11] داڕێژراوە • مۆرفێمی (ایەتی) لە زمانی کوردیدا پاشگرێکی چالاکە و یاریدەی داڕشتنی دەیان وشــەی داوە ، وەك : «کوردایــەتی ، خزمــایەتی ، دۆستــایەتی ، دوژمنایەتی ، دەروێشایەتی •••» • ئەم مۆرفێمە ســوودی لێ وەرگیراوە و لکێنراوە بــە وشــەی «ئــامیر»ەوە و «ئامێرایــەتی»[12] لەســەر وەزنی «دەروێشایەتی» داڕێژراوە • مۆرفێمی (ساز + ی) لە وشەکانی «دانسازی،

---

(١٠) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو دەربارەی وشەی نوێباو ، بڕوانــە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف . وشەی زمانی کوردی ، بەغـدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٣ ــ ٥٥ .

(١١) وشەی « ســەهۆڵدان » بەرانبەر بە « ثلاجة »ی عەرەبی دانراوە ، ( بڕوانە : زاراوی هەمەچەشنە ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، بەغـدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٠ ) . مەبەســتمان لەم نموونەیــە و ئەوانی دیکەش کە بە دوایدا دێن، تەنیا ئەوەیە کە چ دەستورێك ڕەچاو کراوە . دەنا ئەو زاراوانە لە بارن یان نا بە لای ئەم باسەوە گرنگ نییە. هەرچەندە بۆ هەندێکیان سەرنجمان هەیە ، بەلام ئێرە شــوێنی ئەوە نییــە .

(١٢) بڕوانە : زاراوە زانستییەکان ، دانان و لێکۆلینەوەی لیــژنەی زاراوە زانستییەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٤ .

چەخماخسازێ ...»دا بۆ دارشتنی «وشەسازێ»[١٣] بەکارهێنراوە . مۆرفێمی (گەر + ێ) لە وشەکانی «ئاسنگەرێ ، مزگەرێ ...» بۆ ڕۆنانی «ڕۆژنامەگەرێ»[١٤] کراوەتە کەرەستە . مۆرفێمی (ەمەنێ) لە وشەکانی «خواردەمەنێ ، سوتەمەنێ ...»یەوە سوودێ بۆ دانانانی «چاپەمەنێ»[١٥]و «مزرەمەنێ»[١٦] لێوەرگیراوە ... هتد .

هەمو ئەو وشانە و گەلێکی تر بەو ڕێگایانە و یاخود بە ڕێگای ناسراوی دیکەدا لەسەر بنچینەی ئەو وشانە و ئەو کەرەستانەی زمان کە هەبوون ، پەیدابوون . بەو جۆرە ، لەو ڕێگەیەوە گەلێك وشەی نوێ چووەتە سەر خەرمانی وشەکانی زمان . جا دیاریێ کردنی مۆرفێم و دەور و واتایان لە زماندا کارێکی گەورە و پێویستە ... هەندێ جار پشت گوێ خستنی چمکێکی دەبێتە هۆی هەڵە و دروست کردنی وشەی نەگونجاو و نالەبارە. هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە لە زمانی کوردیدا گەلێك وشەی وا بەرچاو دەکەون ، کە ناچنە دڵی خەڵکەوە و سەرنج و کێشەیان لە سەر هەیە .

## جۆرەکانی مۆرفێم

### ١ ـ مۆرفێمی ڕیشەیی — Root morpheme

بچوکترین بنکەی وشە ، کە مانای سەرەکیی وشە هەڵگرێ، لە زانستی زماندا بە مۆرفێمی ڕیشەیی ناسراوە . بە وێنە « ڕەش » لە وشەی

---

(١٣) بڕوانە : لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠ .

(١٤) لە چاپەمەنێ و نوسینی کوردیدا زۆر بەکار دەهێنرێ .

(١٥) لە زۆر نوسیندا بەرچاو دەکەوێ .

(١٦) مزرەمەنێ ـ حمضيات . بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، زاراوی هەمەچەشنە ، ل ١١ .

« ڕەشایی »دا بنکەیە و مۆرفێمی ڕێشەیی‌یە ؛ لە وشـــەی « چڵکن »دا ــ « چڵك » بچوکترین بنکەیە و مانای سەرەکی وشەکەی هەڵگرتووە ؛ لە وشەی « بەهێز »دا ــ « هێز » بنکەیە ؛ « هات » لە وشەی « هــاتن »دا ؛ « چو » لە وشەی « چون »دا مۆرفێمی ڕیشەیین ••• هتد •

هەروەها بەشـــی هەرە زۆری ئـــەم جۆرە مۆرفێمانە بە شـــێوەی سەربەخۆش خۆیان دەنوێنن و واتا دەبەخشن • هەر لەبەر ئەوەشە هەندێ جار لە زانستی زماندا مۆرفێمی ڕێشـــەیی بە ( مۆرفێمی ســـەربەخۆ ) ناو دەبرێ •

بە وێنە وشەی « شار » مۆرفێمێکی سەربەخۆیە و مانای هەیە و خۆی بە تەنیا بەکاردێت ••• هەر بەو چەشنەش سەدان وشەی‌تر ، وەك : مار ، باڵ، ساڵ ، دار ، چاو ، ئاسن ، بڵند ، کەم ، زۆر ، جوان ، ســـەر، سەوز، زستان ، پایز ، بزن ، گەرم ••••• هتد •

## ٢ ــ مۆرفێمی وشەداڕێژەر — Derivational morpheme

هەرچەندە ڕەگی وشە مانای سەرەکی وشە هەڵدەگرێ ، بەڵام هیچ زمانێك ئەو توانایەی نییە تەنیا بە ڕەگ و وشەی سادە مەبەست دەربڕێ •

ڕەگی وشە و وشەی سادە بە یاریدەی پێشگر و پاشـــگر دەتوانن سەدان وشە دروست بکەن و ســـەدان مانا و مەبەست دەربڕن • بـــە وێنە پاشگری (ێنە) کە دەچێتە سەر وشەی « نیسك ، ماش ••• » ، دو وشەی نوێ دادەڕێژێ : « نیسکێنە ، ماشێنە ••• » ؛ پاشگری ( ین ) کە بە وشەی سادەی « سەر ، نەرم ••• »ەوە دەلکێ ، ئەو دەمە وشـــەی داڕێژراوی « سەرین ، نەرمین ••• » ســـازدەبێ ؛ پشگری ( ار ) کە بە ڕەگی کرداری « وتن ، کوشتن ••• »ەوە دەنوسێ ، وشەی « وتار ، کوشتار ••• » پێك

دێنێ • پێشگری (ڕا) کە دەچێتە سەر کرداری سادەی «هاتن ، بوون•••»، دەیانکاتە « ڕاهاتن ، ڕابوون ••• » کە کرداری داڕێژراون ؛ پێشگری (بێ) کە بە ناوی سادەی « هۆش ، هێز ••• »ەوە دەلکێ ، دەیانکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراوی «بێهۆش ، بێهێز•••» ؛ پێشگری (پێ) کە بە ڕەگی کرداری سادەی «ویستن، خەفتن •••»ەوە دەتوسێ ، ناوی داڕێژراوی «پێویست، پێخەف ••• »یان لێ ساز دەکات ••• هتد •

بەم چەشنە ، ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەوری وشەڕۆنـان دەبینن ، جۆرێکی تایبەتین لە مۆرفێم و لە زانستی زماندا بە (مۆرفێمی وشەداڕێژەر) ناسراون •

### ٣ ـ مۆرفێمی وشەگۆڕ — Inflexional morpheme

لە سەرەوە لە مۆرفێمی وشەداڕێژەر دواین و نیشـانمان دا کە چۆن لەکاتێکدا دەچنە سەر ڕەگێك یاخو وشەیەکی سادە، وشەیەکی نوێی داڕێژراو دێننە کایەوە ••• بەڵام پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە وشەکانی زمان لە ناو خۆیاندا پەیوەندێ هەمیشەیی‌یان هەیە • ئەو وشـانەی فرێز و ڕستە پێکدەهێنن پەیوەندێ ئاشکرا و دیارێ کراویان لەگەڵ یەکتردا هەیە • بۆ دەربڕینی هەر مەبەستێك ، وشەکان بە گوێرەی دەستوری ئەو زمانە دەچنە پاڵ یەك و فۆرمەی پێویستی خۆیان وەردەگرن و ڕسـتە پێکدەهێنن و مەبەستی دیارێکراو دەگەیەنن •

وەك :

★ ئەو کوڕە ناوی سەردارە •

سەردار کوڕی خاڵە شاسوارە •

کوڕەکەی خاڵە شاسوار ناوی سەردارە •

له نێو کوڕانی خاڵه شاسواردا سەردار دیارە •
سەردار کوڕێکی چاکە •
• • • • • • • • • • • • هتد •

★ سەردار چوو بۆ قوتابخانە •
سەردار دەچوو ( ئەچوو ) بۆ قوتابخانە
سەردار بچۆ بۆ قوتابخانە
• • • • • • • • • • • • • • • • • هتد •

بەو نموونانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە یەکێك لە هۆ کاریگەرەکانی ڕێکخستنی وشە ، مۆرفێمی وشەگۆڕە • مۆرفێمی وشەگۆڕ دەچێتە سەر وشە و حاڵەتی جیاوازی ڕێزمانی پێكدێنێ • مۆرفێمی وشەگۆڕ کە بریتییە لە نیشانە ، وەك پێشگر و پاشگر بە سەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێن[17] • لە بەشی یەکەمی ئەو نموونانەی سەرەوەدا ، نیشانەی ( ە ، ی ، ەکە ـ ی ، ان ـ ی ، ێك ـ ی ••••) بە کۆتایی وشەی «کوڕ»ەوە لکاون و حاڵەتی جیاوازی ڕێزمانییان دەربڕیوە • لە وشەکانی بەشی دووەمیشدا ( دە ، ئە ، بـ •••) کە لە سەرەتاوە هاتوون هەمان ئەرکیان بەجێهێناوە[18] •

(17) ڕاستە نیشانە، هەر وەك پێشگر و پاشگر، بە سەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێ ، بەڵام دەوری جیاواز دەبینێ. هەرچی پێشگر و پاشگرە دەوری داڕشتنی وشە دەبینن ، کەچی نیشانە مانای ئیسبێ دەگەیەنێ ـ واتە دەوری گۆڕینی حاڵەتی ڕێزمانی وشە دەبینێ .
لە بەشێکی تایبەتی ئەم کتێبەدا ( باسی پێشگر و پاشگر و نیشانە و جیاوازی لە نێوانیان و دەوریان لە ڕێزماندا و بە هەڵەچوونی هەندێ نووسەر لە تێکەڵکردنیاندا کراوە ) .

(18) ئەو نیشانانەی لە زمانی کوردیدا ئەرکی گۆڕینی وشە بەجێ دەهێنن زۆرن . لێرەدا بەکورتی لێیان دواوین ، چونکە لەم بەشەدا مەبەست وشەڕۆنانە و ئەوانیش دەوری ڕۆنانی وشە نابینن ... بەڵام لە شوێنی پێویستدا بە فراوانی باسیان لێوە کراوە .

بەم چەشنە بۆمان ڕوون بووەوە کە لە زمانی کوردیدا دوو جۆر مۆرفیمی وشەگۆڕ هەیە و پێیان دەوترێ ( نیشانە ) • ئەو نیشانانەی بە کۆتایی وشەوە دەلکێن بە ( Inflexion ) ناسراون • نیشانەی کۆتایی لە زوربەی زمانەکانی جیهاندا باوە • هەرچی جۆری دووەمی نیشانەیە کە بە سەرەتای وشەوە دەلکێ و لە زمانی کوردیدا باوە ، لە زانستی زماندا( Augment )ی پێ دەوترێ • ئەم جۆرەیان لە کەم زماندا بەدی دەکرێ • بە وێنە لە زمانی ئینگلیزی و ڕووسی ••• دا نییە ، بەڵام لە « زمانی یۆنانی کۆن و سانسکریتیدا دەبێتە نیشانەی کرداری ڕابوردووی سادە و دوور »[19] •

مۆرفیمی جۆری دووەم و سێیەم ــ واتە مۆرفیمی وشەدارێژەر و مۆرفیمی وشەگۆڕ بە شێوەی سەربەخۆ کار ناکەن و واتا نابەخشن • لەبەر ئەوە هەندێ جار لە زانستی زماندا بە هەردووکیان دەڵێن ( مۆرفیمی بەند یاخود مۆرفیمی ئەفیکسی ) •

# شێوەی مۆرفیم

( نمط المورفيم — Allomorph )

بە چەند شێوەیەک کە لە یەک مۆرفیمدا کۆدەبنەوە ، دەڵێن شێوەی مۆرفیم • بەشێکی زۆری شێوەی مۆرفیمی زمانی کوردی ئەوانەن کە هۆی فۆنەتیکی پێکیان دەهێنێ • بە وێنە ئەگەر مۆرفیمی (وە) لە وشەی « چوونەوە »دا ببێتە (ەوە) ، ئەوە مۆرفیمێکی‌تر پەیدا نابێ ، بەڵکو شێوەی هەمان مۆرفیمە ، بەڵام پێویستی فۆنەتیکی ئەو شێوەیەی پێداوە • یاخود ئەگەر مۆرفیمی (ەکە) کە نیشانەی ناسیاوی‌یە بە چەند شێوەیەکی تر ، وەک

(١٩) گ. س. کاچکینا ، کێشەی واتای مۆرفیم ، لێنینگراد، ١٩٦٣، ل.٤٠.

(كه ، يەكه...) بەرچاو بكەوێ ، ئەوە ناكرێ بە مۆرفێمێكی دیكه دابنرێ، بەڵكو ئەوانە شێوەی مۆرفێمی ( ەكه )ن ... ئـەو جۆرە حاڵەتانە كە لە زانستی زماندا بە شێوەی مۆرفێم ناسراون، لە زمانی كوردیدا زۆرن ، وەك:

| | |
|---|---|
| گه / گا | ڕێگه ــ ڕێگا ، جێگه ــ جێگا |
| یك / ییك / یەك / ێ | شەویك ــ چراییك ــ چەقۆیەك ــ ڕۆژێ |
| وان / ەوان | گاوان ــ باخەوان |
| بەند / بەن | ناڵبەند ــ ناڵبەن[20] |
| كه / ەكه | لەتكه ــ كوڵەكه[21] |
| وەر / ەوەر | سەروەر ــ جانەوەر |
| كه / ەكه / یەكه | دەرگاكه ــ كوڕەكه ــ چرایەكه[22] |

................ هتد .

---

(٢٠) هەندێ جار دەنگی ( د ) لە وشـەدا ( بەتایبەتی لە شێوەی سلێمانیدا) دەكەوێ ، هەندێ جاریش دەبێ بە ( ن ) . ئەگەرچی ئەو قـوتدان و گۆڕانە لە ئاخاوتنی ناوچەی سلێمانیدا هەیە ، بەڵام لە زمانی ئەدەبی و نوسیندا پێویسـتە واز لەو جۆرە تـایبەتیـانە بهێنرێ . لە بریتی : « ناڵبەن ، مناڵ ، ئەكەم ... » ڕاستتر وایە بنوسین : « ناڵبەنـد ، منداڵ ، دەكەم ... » .

(٢١) ئەمە لەگەڵ (ەكه)ی ناسیاویدا جیاوازە. ئەم پاشكرە و، ئەو نیشانەیە.

(٢٢) لە زمانی كوردیدا ، شێوەی مۆرفێم لە ڕێگەی تێچونی بزوێن یاخـود پەیدابونی نیمچەبزوێنەوە دروسـت بـوون ، كـە ئەویـش هـۆی فۆنەتیكیيە ... بۆ وەرگرتنی زانیاریی پتر لە بارەی تێچونی بزوێن و پەیدابونی نیمچە بزوێنەوە ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مـارف ، زمانی كوردی لە بەر ڕۆشنایی فۆنەتیكدا، بەغدا ، ١٩٧٦، ل ٥٤ــ٥٦.

# پێشگر و پاشگر و نیشانە

بە سەرپاکی ئەو سێ زاراوە ـ واتە پێشـــگر و پاشگر و نیشانە ـ دەوترێ ( گیرەك ـ Affix )[٢٣] . ئافیکس ئـــەو مۆرفێمەیە کە واتای ڕێزمانێ هەیە . گیرەك لە زماندا بە تەنیا بایەخی نییە ، بەڵکو کە دەچێتە سەر وشە دەتوانێ دەوری دروست کردنی وشە ببینێ و واتا ببەخشێ .

پێشـــگر کە بـــە لاتینێ ( Praefixus )ی[٢٤] پێ دەڵێن ، ئـــەو مۆرفێمەیە کە بە پێشی وشەوە دەلکێ[٢٥] و ڕواڵەت و ناوەڕۆکی وشـــە دەگۆڕێ و دەوری ڕۆنانی وشە دەبینێ .

پاشگر کە بە لاتینێ بە ( Sufixus ) [٢٦] ناسراوە ، ئەو مۆرفێمەیە کە

---

(٢٣) ئافیکس لە وشەی ( Affixus ) ی لاتینییەوە وەرگیراوە و بە مـــانای ( گیر . چەسپاو ، لکاو ، نوساو . . . ) دێت .

(٢٤) وشـەی ( پرێفیکس ـ Praefixus )ی لاتینێ پێکهاتووە لە : ( Prae ـ پێـش ، بـــەردەم . . . ) و ( Fixus ـ گـیر ، لکـاو ، نوسـاو ، چەسپاو . . .) . بەم چەشـنە وشەی پرێفیکس بە مانای ـ پێشگر ـ دێـت .

(٢٥) لەو ڕایەدام د. نەسرین فەخرێ لەوەدا بە هەڵە چووە کە وای دانـاوە پێشگر «دەکەوێتە پێش بناغەی وشـــە»وە ( بڕوانـــە : د. نەسریـــن فەخرێ ، پاشگر و پێشگری ( ڤە ـ یان ـ وە ) لە زمـانی کوردیـدا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٣٨ ). د. نەسرین لەکاتێکدا کە سوودی لە سەرچاوەی ڕۆســێ وەرگرتووە ، تایبەتێتی زمانی کوردێ تێدا نەخوێندۆتەوە . لەبەرئەوە کە لە زمانی ڕۆسیدا هەردەم پێشـگر دەکەوێتە پێش بناغەی وشەوە ، وای بڕیـار داوە لــە کوردیشـــدا دەبێ هەر بەو چەشـــنە بێ . بەڵام هێنـــانەوەی چەند نموونەیەك ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکا ، کە مەرج نییە وا بێ . بە وێنە لە کرداری «هەڵدەگرم»دا ، (دە)ی نیشـانەی موزارەعەت ؛ لە کرداری «ڕامکرد»دا جێنـاوی لکاوی کەســی یەکەمــی تـاك ؛ لە کـرداری «وەربگرە»دا ، (ب)ی نیشـانەی فەرمان . . . لە نێوان پێشگر و بناغەدا هـــاتوون .

(٢٦) وشـەی ( سوفیکس Sufixus )ی لاتینـێ لە دوو بەش پێکهـاتووە : ( Su ـ پـــاش . . . ) و ( Fixus ـ گـیر ، لکـاو ، نوسـاو ، چەسپاو . . .) . بەم جۆرە وشـەی سوفیکس مانای پاشگر دەبەخشێ.

به کۆتایی بناغەی وشەوە دەنوسێ و ڕواڵەت و ناوەڕۆکی وشە دەگۆڕێ و دەوری ڕۆنانی وشە دەبینێ[٢٧] •

جیاوازی پێشگر و پاشگر تەنیا لە شوێنی پێوەلکاندایە • ئەویش ئەوەیە کە پێشگر بە پێشی وشەوە دەنوسێ ، هەرچی پاشگرە بە پاش بناغەی وشەوە دەلکێ •

نیشانە ( Marker ) ئەو مۆرفیمەیە کە بە سەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێ و مانای جودا جودای ڕێزمانی دەردەبڕێ •

گەلێك لە زانایانی زمان لەو ڕایەدان کە بەشی زۆری پێشگر و پاشگر لە زوودا وشەی سەربەخۆ بوون و بە تەنیا مانایان داوە و لە دواییدا بۆ دەربڕینی مانای نوێ لەگەڵ وشەی تردا یەکیان گرتووە و وشەی لێکدراویان هێناوەتە کایەوە ••• ئەنجامی وشە لێکدان بووەتە هۆی گۆڕینیان • دیارە بە تێپەڕبونی کات و زۆر بەکارهێنان هەندێکیان لێ‌سواوە و بەرە بەرە فۆرمی تازەیان وەرگرتووە •

بێ‌گومان هەر زمانێك لە چەشنی بەکارهێنانی پێشگر و پاشگر و نیشانەدا خاوەنی خاسیەتی تایبەتی خۆیەتی • بە وێنە زمانی وا هەیە ، وەك زمانی ( تورانیکان ، ئوگۆرە ــ فینی ) کە پێشگر بەکار ناهێنن و هەمو ڕێزمانیان بە هۆی پاشگرەوە دەردەبڕن • بەم جۆرە تێکڕای وشەکانی ئەو زمانانە لە ڕەگی وشەوە دەست پێ دەکەن و لە کۆتاییەوە بە پێی پێویست زنجیرەیەك پاشگر دێت • زمانی دیکەش هەیە بە پێچەوانەوە پێشگر بەکار دەهێنن و پاشگر ( لە هەندێ حاڵەتی بیژۆکدا نەبێ ) بەکارناهێنن ،

---

(٢٧) د. نەسرین فەخری ، لە لاپەڕە ٢٣٧ ــ ٢٤٠ی وتاری : پاشگر و پێشگری ( ڤە ــ یان ــ وە ) لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ هەندێ زانیاری لە بارەی پێشگر و پاشگرەوە پێشکەش کردووە .

وەك ( زمانی سـوا حیلی ) کە لە خێزانی ( باتـو )وە ـ ( ئاوەڕاستی ئەفەریقا )[٢٨] •

زمانە هیند و ئەورۆپاییەکان ، کە زمانی کوردیش یەکێکە لەو خێزانە، هەردوك ـ واتە پێشگر و پاشگر ـ بەکار دەهێنن • بە وێنە «بەربۆنەوە» لە پێشـگری « بـەر » و کرداری « بـۆن » و پـاشگری « وە ( ەوە )» پێکهاتووە ؛ وشـەی « بێهێز » لە پێشـگری «بێ» و « هێز » کە نـاوە پەیدابووە ؛ وشەی «ئاسنگەر » لە «ئاسن» و پاشگری «گەر» دروست بووە ••• هتد •

پێشـگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ئەو دەورەش دەبینن ، کە وشەیەك لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بکەنە بەشێکی دیکەی ئاخـاوتن ، واتە ناو دەکەنە ئاوەڵناو ، یاخود بە پێچەوانەوە ئاوەڵناو دەکەنە ناو•••هتد• بە وێنە وشەی «هێز» ناوە و «بەهێز» کە ئاوەڵناوە بە یاریدەی پێشگری (بە) دروست بووە؛ وشەی «زێڕ» نـاوە ، دەمێ کە پـاشگری (ین)ی دەخرێتە سـەر دەبێتە ئاوەڵناو ـ «زێڕین» ؛ وشەی «ورگ» ناوە ، کاتێ پاشگری (ن ـ in )ی لەگەڵ بەکـار دەهێنرێ «ورگن» پەیدا دەبێ کە ئاوەڵنـاوە ••• وشـەی «درێژ» ئاوەڵناوە ، کە پاشـگری (ێ) پێوە دەلکێ دەبێتە «درێژێ» کە ناوە؛ وشەی «ڕەش» ئـاوەڵناوە ، کە پـاشگری (ایێ)ی دەچێتە سـەر دەبێتە «ڕەشایێ» و ئاوەڵناوەکە دەگۆڕێ بۆ ناو ؛ وشەی «زەرد» ئاوەڵناوە و بە یاریدەی پاشگری (ێنە) وشەی «زەردێنە» پێكدێ و ناو پەیدا دەبێ ••• وشـەی «هۆش» کە نـاوە ، کاتێ پێشگری (بێ)ی پێـوە دەلکێ دەبێتە ئاوەڵناو ـ « بێهۆش » ، کەچی ئەگەر پاشـگری (ێ)یشی بخرێتە سـەر ئەوە سەر لە نوێ دەبێتەوە ناو ـ «بێهۆشێ » ••• هتد •

---

(٢٨) ئا. ئا. ڕێفۆرمـاتسکێ ، سەرەتایێکی زمـانناسێ ، چـاپی چوارەم ، مۆسکۆ، ١٩٦٧ ، ل ٢٦٣ ـ ٢٦٤ •

له وشەی ئاسادەی زمانی کوردیدا پاشگر هەمیشە لە دوای ڕەگی وشەوە دێت و ئنجا بە دوای ئەودا نیشانە ــ واتــە هەرگیز پاشــگر پێش نیشانە دەکەوێ • بە وێنە : وشــەی «فێڵبــازتر» کە لە وشــەی «فێڵ» و پاشگری «باز» و نیشانەی « تر » پێکهاتووە ؛ وشەی «ئاسنگەران» کــە لە وشەی «ئاسن» و پاشگری «گەر» و نیشانەی «ان» پەیدابووە ؛ وشەی «مۆمدانەکە» کە لە وشەی «مۆم» و پاشگری «دان» و نیشــانەی «ەکە» دروست بووە ••• هتد • بەڵام مەرج نییــە لە هەمو زمــانێکدا پاشــگر یەکسەر لە دوای ڕەگی وشەوە بێت و ئنجا نیشانە بێت• لە هەندێ زمانــدا ڕێ دەکەوێ پاشگر دەکەوێتە دوای نیشــانە ، واتە بە پێچەوانــەی زمانی کوردییەوە • بە وێنە لە زمانی ئەڵەمانیدا ؛ وشــەی (( kind )) بە مــانای «منداڵ» دێت و (( kinder )) بە مانای «منداڵان» ، بەڵام (( kinderchen )) دەبێتە « منداڵۆچکان » • لێرەدا ( er ) کە نیشانەی کۆیە کەوتۆتە پێــش ( chen ) ەوە کە پاشگرە بۆ واتای بچوك کردنەوە[٢٩] •

پێشگر و پاشگر لەگەڵ نیشانەدا بە جۆری مانای ڕێزمانی لەیەك جودا دەکرێنەوە • پێشگر و پــاشگر ــ مانــای دارێژە ( المعنى الاشتقــاقي ــ — Derivational meaning ) دەدەن ، هــەرچی نیشــانەیە مــانای نیسبی ( المعنــى النســبي — Relational meaning ) دەگەیەنێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار لێك جودا کردنەوەیان ئاسان نییە[٣٠] •

---

(٢٩) لێرەدا وشە کوردییەکە ــ « منداڵۆچکــان » لەگەڵ ئەڵەمانییەکەدا ــ (( kinderchen )) وەك یەك نین ، واتە لە ئەڵەمانییەکەدا پاشگر کەوتۆتە دوای نیشانەوە ، کەچی لە کوردییەکەدا بە پێچەوانەوە نیشانە کەوتۆتە دوای پاشگرەوە .

(٣٠) لە بەشێکی زۆری ئــەو لێکۆڵینەوانەدا کە دەربــارەی زمــانی کوردی نوسراون ، ئەوە بەدی دەکرێ کە نیشــانە لەگەڵ پێشگر و پاشــگردا تێکەڵ کراوە .

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە کتێبی «گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی

=

جگه له پێشگر و پاشگر و نیشانه ، که جۆری هەره گرنگ و ناسراوی ئافیکسن ، له زمانانی جیهاندا چەند جۆره ئافیکسێکی دیکەش بەدی دەکرێ :

---

= کوردیدا » گەلێك نیشانەی ، وەك (تر)ی پلەی بەراورد و (ترین)ی پلەی بالاّ و (ان)ی کۆ و (ەکە)ی ناسیاوێ و (ێك)ی نەناسیاوێ و کۆتایێ هەندێ کردار ( را ــ له « کێلرا ، ڕۆخێنرا. . . » )دا و (رێ ــ له «ئەخوێنرێ، بنوسرێ . . . » )دا . . . به پاشگر ، و (ئه)ی موزارەعـەت و ( ب ـ )ی فەرمانی به پێشگر داناوه و لەگەڵ پێشگر و پاشگری ڕاستەقینەدا هیچ جودای نەکردۆنەتەوه .

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامـانێ له کتێبـی « سەرەتـایێك له فیلۆلۆژێ زمانی کوردێ »دا ( ل ١١٢ ــ ١٢٣ ) ، نەك هەر نیشانەکانی به پێشگر و پاشگر دانـاوه ، بەڵکو لەبەر باسـیان و درێـژەپێدانیان بەشێکی زۆری پێشگر و پاشگره گرنگەکانی باس نەکردوه .

جا بەو پێیه ئەمه له سەرێکەوه بووەته هۆی ئەوەی به زۆر نیشانـه بکرێ به پێشگر و پاشگر و ، له سـەرێکی دیکەوه پێشگر و پاشگره ڕاستەقینەکان دەرنەکەون .

سەرەڕای ئەوه ، نوسـەر له بەشی ( پاشگر )دا هەنـدێ وشـەی واتاداری سەربەخۆی به پاشگر داوەتـه قەڵەم ، وەك : ( «خـان» له وشەی « مەحموود خـان »دا) ؛ («دار» لـه وشـەی «سـپیدار»دا) ؛ («کۆن» له وشەی « جلەکۆن»دا ) . . . جێگەی ڕەخنەیـه که نوسـەر جیاوازێ له نێوان (نیشانه) و (پێشگر و پاشگر) و (وشه)دا نەکردوه . به وێنه مامۆستا ڕاناوی لکاوی (ت)ی له وشەی «گـەلت» و (ەکه)ی نیشانەی ناسیـاوێ . . . وشـەی « پیـاو » له وشـەی لێکدراوی «پیرەپیاو»دا و وشەی «شێر» له وشەی لێکدراوی «دەمەشێر»دا. . . پاشگری (چێ) له وشەی داڕێژراوی «چایچێ» و پاشگری ( سـتان ) له وشەی داڕێژراوی «کوردستان»دا . . . وەك یەك داناوه و له ژێـر باسی (پاشگر)دا، که ئەو زاراوی (پاشبەند)ی بۆ داناوه ، باسی هەمۆیانی کردوه .

کەریمی ئەیوبێ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا هەرچەنده هەندێ جار نیشانه به پێشگر و پاشگر ناو دەبەن ، بەڵام له هیچ شوێنێکـدا به پێشـگر و پاشگری داڕێژەیان دانەناوه .

هەرچەنده لیژنەی « زمان و زانستەکانی » کۆڕ له بەشـی کرداری =

### ١ ـ ئینتەرفیکس(٣١)

ئەو مۆرفێمە یاریدەدەرانەن کە مانـای خودیـان نییـە ، بەلاّم لە لێکدانی وشەدا هاریکاریێ دەکەن • ئەم جۆرە مۆرفێمانە ، کە دەکرێ پێیان بوترێ ـ مۆرفێمی پەیوەندیێ ، لە وشەی لێکدراودا بەدی دەکرێن • لـە زمانی کوردیدا چەند ئینتەرفیکسێك هەیە ، وەك :

أ ـ ( ە ) :

بەردەنوێژ ، مزرەسێو ، بۆکەشۆشە ، گوڵەباخ •••

ب ـ ( و ) :

لەرزوتا ، هێلکەوڕۆن •••

ج ـ ( ەو ) :

بانەوبان ، شارەوشار ، دارەودار •••

د ـ ( او ) :

ڕەنگاوڕەنگ ، دەماودەم ، چەماوچەم •••

---

=

دارێژراودا نیشانەکانیان وەك پێشگر و پاشگر نەژماردوە ، بەلاّم ئەوەی جێی سەرسوڕمان بێ ، ئەوەیە کە لە بەشی ئاوەڵنـاوی دارێـژراودا نیشانەی ( ەم ـ هەشتەم ... ) ، (ەمین ـ هەشتەمین ...) ؛ ( تر ـ گەورەتر ...) ؛ ( ترین ـ گەورەترین ... )یان نەك هـەر بە پـاشگر داوەتە قەڵەم ، بەڵکو بە پاشگری دارێژەریشیان داناون... (بڕوانە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤٨٥ . گریمان لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا پێویست بەوە نەکات لە ڕۆی زاراوەوە (نیشانە) لە (پێشگر و پاشگر) جـودا بکرێتەوە ، بـەلاّم خۆ دەبێ بە جۆری مانای ڕێزمانیێ لە یەك جودا بکرێنەوە .

(٣١) لە ( Interfixus ) ی لاتینییەوە وەرگیراوە .

هـ ــ ( ان ) :

بەرانبەر ، سەرانسەر ...[٣٢]

ی ــ ( بە ) :

چاوبەکل ، گوڵبەدەم ، جێبەجێ ...[٣٣]

هەندێ کەرەستەی دیکەی مۆرفۆلۆژێ هەن تا ڕادەیەك لە ئینەرفیکس دەچن . بە وێنە ، ئاشکرایە لە زمانی کوردێدا (ن) نیشانەی چاوگە و سەرەڕای ئەوەش (ا ، ت ، ۆ ، ی ، د ) دەکەونە پێشیەوە . لە هەندێ حاڵەتدا ئەو دەنگانە دەکەونە ڕەگی کردارەوە و لە هەندێ حاڵەتیشدا لە پێکهێنانی ڕەگدا بەشدارنابن . بە وێنە ( ۆ ) لە چاوگی تێپەڕی «درۆن»دا دەکەوێتە ڕەگی کردارەکەوە کە «درۆ»وە ، بەڵام هەمان ( ۆ ) لە کرداری تێنەپەڕی «چۆن»دا هاوبەشێ لە ڕەگی کردارەکەدا ناکات کە ( چ )ە ــ واتە لەم حاڵەتەیاندا ( ۆ ) بە ڕواڵەت لە ئینتەرفیکس دەچێت ... بەڵام لە ڕاستیدا ئینتەرفیکس نییە ، چونکە دەورەکەی ئەو نابینێ .

---

(٣٢) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (٦٤)ی کتێبی «ڕێزمانی کوردێ»دا، سلێمانێ ، ١٩٦٠ . لە ژێر ناوی ( ئامراز )دا باسی هەندێك لەو ئینتەرفیکسانەی کردوە .

(٣٣) لە زمانی ڕۆسیدا تەنیا دۆ ئینتەرفیکس هەیە :

أ ــ ( ۆ ) :

پارۆخۆد ( پاپۆڕی هەڵم ) ، سامۆلیۆت ( فڕۆکە ) ، سامۆڤار ( سەماوەر ) ...

ب ــ ( ێ ) :

زێملیمێر ( زەویپێو ) ، زێملیترێسێنییا ( بومەلەرزە ) ، زێملیڤلادێلیتیس ( خاوەن زەوێ ) ...

## ٢ ــ كۆنفیكس — Confix

به بەكارهێنانی پێشگرێـك و پاشـگرێك له یەك وشـەدا دەوترێ كۆنفیكس[٣٤] ، وەك :

نە + خۆش + ێ = نەخۆشێ
بەر + دان + وە (ەوە) = بەردانەوە
وەر + گەڕ + اندن = وەرگەڕاندن[٣٥] .

## ٣ ــ نـاوگر — Infix [٣٦]

ئەو جۆرە ئافیكسانەن كە لە ناوەندێ ڕەگی وشەدا دادەنرێن . بـە وێنە لە زمانی تاگالێدا ، كە لە خێزانی زمانە هیند و ئەورووپاییەكانە ناوگری ( um ) لە وشەی (( sulat )) ــ « نامە »دا نییە ، بەڵام كاتێ لەو وشەیەوە، وشەی (( s — um — ulat )) ــ « نووسین » دادەڕێژرێ ، ئەوسا ناوگری ( um ) دەچێتە ناوەندی ڕەگەكەیەوە ...[٣٧] .

زوربەی ڕۆشنبیران و زمانناسانی كورد بێ لێكۆڵینەوە و لێكدانەوە و بیركردنەوە و شوێن كەوتن و بە دواداگەڕان بڕیاریـان داوە كە نـاوگر لە زمانی كوردیدا نییە ... تاكە تاكەیەكیش بە هەڵە هەندێ زیادییان بە ناوگر

---

(٣٤) لە وشـەی ( Confixum ) ی لاتینییەوە وەرگـیراوە ، كـە بە مـانای ( بەیەكەوەهاتن ، پێكەوەهاتن ... ) دێت .

(٣٥) ئەم دیاردەیە لە زمانی كوردیدا بە زۆرێ لە كرداری تێپەڕدا بەرچـاو دەكەوێ .

(٣٦) لە وشـەی ( Infixum ) ی لاتینییەوە وەرگیراوە ، كە بە مانای (خـستنە ناو ، تێهەڵكێشـان) هاتووە .

(٣٧) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسكێ ، سەرەتایێكی زمـانناسێ ، چـاپی چوارەم ، مۆسكو ، ١٩٦٧ ، ل ٢٦٧ .

داوەتە قەڵەم . کە بە هیچ جۆرێك نـاوگر نین و لەگەڵ تەعریـف و دەوری ناوگردا ناگونجێن[٣٨] .

---

(٣٨) ئەوەی لەم ڕووەوە سەرنج ڕابکێشـێ ، ئەوەیە کە مامۆسـتا محەمەد ئەمین هەورامانی هەندێ حاڵەتی کە بە هیچ جۆرێك ناوگر نین و لەگەڵ تەعریف و دەوری ناوگردا ناگونجێن ، بە نـاوگر دانـاوە . مامۆسـتا هەورامانی (دە) لە وشـەی « هەڵدەفـڕێ ... » ؛ (نـا) لە وشـەی «هەڵنافڕێ ...» ؛ (ب) لە وشەی «دابنیشم ... » ؛ ( ب ) لە وشەی «دەربچۆیتایە...» ؛ (نە) لە وشەی «سەرنەکەوتایە...» ؛ « مە » لە وشەی « ڕامەکە ...»دا بە ناوگر داوەتە قەڵەم . بەم جۆرە ئەو شەش حاڵەتەی کردووە بە ناوگر ...

لام وایە مامۆستا هەورامانی لەمەدا بە هەڵە چووە و ئەوانەی ئەو بە ناوگریان تێگەیشتووە ناوگر نین ، چونکە (دە) و (نـا) و هەردوو (ب) و (نە) و (مە) نەکەوتوونەتە ناو ڕەگی وشـەکانەوە ، بەڵکـو لە تێکـڕای نموونەکانیدا کەوتوونەتە نێوان پێشگر و ڕەگەوە . بە نموونە دەبینین ( دە ) لە وشەی « هەڵدەفڕێ »دا لەنێوان « هەڵ » ( کە پێشگرە ) و «فڕێ» دایـە . کاتێـك ( دە ) دەتوانێ نـاوگر بێت ، کە بکەوێتـە نـاوەندی «فـڕ»ەوە کـە ڕەگـی کردارەکـەیە ... هەروەهـا (ب) لە وشـەی «هەڵبگرە»دا لە نێوان «هەڵ» و «گرە» دایە . کاتێك (ب) دەتوانێ ناوگر بێت . کە بکەوێتە ناوەندی «گر»ەوە ــ واتە بکەوێتە نێـوان « گ » و « ر »ەوە ... هتد .

جگە لەوە زوربەی زۆری نموونەکانی مامۆستا دەتوانن بە بێ پێشگر بەکار بێن ، وەك : « دەفڕێ » ، « نافڕێ » ، «بگـرە» ، «بچۆیتـایە»، «نەکەوتایە» ، «مەکە» ... ئێستا ڕەنگە وا بە خەیاڵدا بێت کە (دە) و (نا) و (ب) و (نە) و (مە) پێشگرن . بەڵام پێشگریش نین ، لەبەر ئەوەی دەوری پێشگر نابینن . چونکە وەنەبێ تەنیا شوێن مەرج بێ ــ واتـە ڕاست نییە ، هەر لەبەر ئەوەی کەوتوونەتە پێشی وشـەوە بەپێشـگر دابنرێـن .

ئەوەی زۆر جێگەی سەرنج و ڕەخنە بێ ، ئەوەیـە کە د. پاکیـزە ڕەفیق حیلمی لە وشـەی « سوتانـدی ، خنکانـدی ، جوڵانـدی ، ڕوخاندی ... »دا پاشگری (اند)ی بە ناوگر زانیوە ، ئەویـش تەنیـا لەبەر ئەوەی بە دوایدا مۆرفیمی (ی) هـاتوە ( بڕوانە : بوژانـدنەوەی زمان . « گوڤاری کوڕی زانیاری کورد »، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٦٤ ــ ١٦٥ ) . بێگومان ئەمە هەڵەیێکی زۆر گەورەیە و ( اند ) بـە =

من چەند ساڵێکە خولیای ئەو باسەم ، بەڵام شتێکی ئەوتۆم لێ ساغ نەکردۆتەوە • ئەو کاتەی هیچ نموونەم دەست نەکەوتبوو بڕیاری نەبوونیم هەر نەدا • کاتێکیش چەند نموونەیەکی کەمم دۆزییەوە یەکسەر بڕیاری بوونیم نەدا •••

ئەوەی شایانی باسە بڵاوبوونەوەی کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی »[39] ، لەم بارەیەوە دەستکەوتێکی نوێی هێنایە ئەنجام• نووسەری ئەم کتێبە ــ مامۆستا مەسعوود محەمەد لە باسی ناوگردا ( ل ٧٧ ــ

=

هیچ جۆرێك ناوگر نییە و لەگەڵ تەعریف و دەوری ناوگردا ناگونجێ . لە نموونەکانی نووسەردا ( اند ) نەکەوتۆتە ناوەندی ڕەگی وشەکانەوە . کاتێك (اند) دەتوانێ ناوگر بێت ، کە بکەوێتە ناوەندی ( سووت ، خنك ، جوڵ ، ڕوخ ...)ەوە . بەو بۆچوونەی د. پاکیزە بێ دەبێ پاشگری ( گەر ) لە وشەی «ئاسنگەری»دا ؛ (باز) لە «فێڵبازی»دا ؛ (ستان) لە «کوردستانی»دا ؛ (ۆلە) لە «مێشۆلەکە»دا ... یاخود پێشگری ( دا ) لە وشەی «تێداچوون»دا ؛ (هەڵ) لە «تێهەڵکێشان»دا ... ناوگر بن، ئەوە ئەو دەمە دەبێ جیاوازی نێوان پێشگر و ناوگر ، یاخود پاشگر و ناوگر چی بێ ؟ وەڵامی ئەو پرسیارە بەلای شارەزای زانستی زمانەوە پێویستە شتێکی سەرەتایی بێ .

د. پاکیزە سەرەڕای ئەوەی ئەو پاشگرەی لێبووە بە ناوگر ، (اند)یش بە (ند) تێگەیشتوە . جێگەی سەرسوڕمانە کە نووسەر لەو دەستوورە سەرەتاییە ئاگادار نییە ، کە بزوێن بە دوای بزوێندا نایەت . کاتێ پاشگری ( اند ) بە دوای کرداری « سووتا ، خنکا ، ڕووخا ... »دا بێت ، یەکێ لەو دوو بزوێنە ــ واتە بزوێنی سەرەتای پاشگری (اند) و بزوێنی کۆتایی کردارەکان « سووتا ، خنکا ، ڕووخا ... » ــ تێدەچێ و یەکێکیان دەمێنێتەوە ... ( شایانی باسە مامۆستا مەسعوود محەمەد ئەم هەڵەیەی د. پاکیزەی ڕاست کردۆتەوە ، بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٣ ، ژ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٥٨ ــ ٢٥٩ ) .

(٣٩) مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٨٥ ) گەلێك ڕۆی گرنگی ئەو کێشەیەی ساغ کردۆتەوە و (٢٢) نمـوونەی هێناوەتەوە کە بە ڕای من زوربەی زۆریان بۆ سەلماندنی بوونی ناوگر لە زمانی کوردیدا بەکار دێن ، وەك :

« بواردن — لە (بوردن)ەوە هاتوە • ئەمیشیـان دەنگێکی ( ا ) هـاتۆتە نێوان ( و ، ر ) و فیعلـەکەی کردوە بـە تێپەڕ » •

« شەبەق — بە واتای ( شـەق بردنێکی گەورە ) ، پێ دەچـێ لە وشەی ( شەق وەرگیرابێ ) » •

« برێشکە — لە برژانەوە هاتوە • دیـارە دەنگێکی ( ێ ) لەلاوە هاتوە بۆ ناوئاخنی وشەکە •••••• » •

•••••••• ئەمانە و گەلێکی تر [٤٠] •

چۆن گومان لەوەدا نییە کە هەر یەك لەو نموونانە دەنگێك وە یا زیاتری لە لاوە بۆ هاتوە ، وەك : ( ا ) لە وشـەی « بواردن »دا ؛ (بە) لە وشـەی «شەبەق»دا ؛ (ێ) لە وشەی « برێشکە »دا ••• هەروەها گومان لەوەشدا نییە کە دەوری ناوگر دەبینن •

سەرەڕای ئەو هەموو نموونە لەبارانە و ئەو ئەنجامە زانستییە نوێیانە ، ئنجا نووسەر بەگیانێکی لەخۆبوردوانەوە دەڵێ :«لەم نووسینەشدا بەجۆرێکی یەکجاریی دان بە بوونی ناوگری کوردیدا ناهێنم ، بەڵام ئەوەندەی جارانیش دیاردەی بوونی ناوگر لە بەشێکی وشەکانی کوردیدا بەلاوە نـاتێم چونکە وەك دەردەکەوێت لەم نووسینەدا باسـی ناوگر و بوون و نەبوونی ڕێبـازێکی ڕوونتری هەیە لەوەی تائێستا بە بیراندا هاتوە »[٤١] •

---

(٤٠) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو ، بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٧٨ ــ ٨٢.
(٤١) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٧٨ .

ئەو ئەنجامەی مامۆستا مەسعود دەستکەوتێکی گەورەیە لە مەسەلەی ناوگردا و بەڵگەیەکی راست و واقیعییە بۆ چاوپێداگێڕانەوەی هەندێك لەو بیروباوەڕە هەڵانەی خەریکی ڕەگ داکوتان بوون ... بەڵام لەگەڵ هەمـوو ئەو سەرکەوتنەشدا ، ئەم باسە هێشتا شوێن کەوتن و لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەلتری دەوێ .

## وشە لە ڕووی ڕۆنانەوە

وشەکانی زمانی کوردی لە ڕووی ڕۆنـانەوە دەبن بە دوو بەش :

١ـ ئەو وشانەی بەسەر مۆرفیمدا دابەش دەبن .

وەك : کۆگا ، بەڕێز ، دەستبڕ ، ساردی ، شەکرەسێو ، بێخەو ، سەرۆك ، !نە ، سەرمابردەڵە ، هاوینەهەوار ... هتد .

٢ـ ئەو وشانەی بەسەر مۆرفیمدا دابەش نابن .

وەك : سەر ، شەڕ ، بن ، جۆ . لوت ، ڕان ، ئـەو ، شـەو ، دار ، بەرد ، هێز ، ژن ... هتد .

کەرت کردنی وشە لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا کارێکی گرنگە . ئەمە نەك تەنیا چۆنیەتی ڕۆنان و پێکهاتن و دروست بوونی وشە ئاشکرا دەکا ، بەڵکو یارمەتی ڕۆنکردنەوەی تـەواو و قووڵتری مانا و ناوەڕۆکیشی دەدات و پەیوەندی لەگەڵ وشەی تردا دیاری دەکـا .

لە زمانی کوردیدا بۆ ڕۆنانی وشە چەند ڕێگەیەك هەیە . ئەوەی لـە ناویاندا سەرەکی بێ (داڕشتن) و (لێکدان)ە ـ واتە ئەو دوو ڕێگەیە هۆیەکی گرنگن لە دروستکردنی وشەی داڕێژراو و لێکدراودا .

وشەی دارێژراو ــ ئەو وشە ناسادەیەیە کە لە وشەیەکی سادە و زیادێ پێکهاتبێت • ئەوجا زیادییەکە پێشگر یا پاشگر یا هەردوو (پێشگر و پاشگر) پێکەوەبن ، وەك : کارگە ، زستانێ ، تێچوون ، بەهێز ، لێسەندنەوە ، هەڵکەندنەوە ••• هتد •

وشەی لێکدراو ــ ئەو وشە نادەیەیە کە وا بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدا بێ ، وەك : بەردەنوێژ ، گوڵەگەنم ، دڵشاد ، ڕەشپۆش••• هتد[٤٢] •

## وشەی دارێژراو

( Derivational word — الكلمة المشتقة )

وەك لە سەرەوە باسمان کرد ئەو زیادییەی دەچێتە سەر وشەیەکی سادە و دەبێتە هۆی دروستکردنی وشەی دارێژراو بریتییە لە : پێشگر و

---

(٤٢) بۆ تەعریفی وشەی دارێژراو و لێکدراو بە تایبەتی سوودم لەو پێناسە وەرگرتوە ، کە لیژنەی « زمان و زانستەکانی » کۆڕ بۆ ناوی دارێژراو و لێکدراو پەسەندی کردوە ( بڕوانە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤٠٤ ــ ٤٠٥ ) .

لیژنەی ناوبراو سنوری تەواوی لە نێوان وشەی دارێژراو و لێکدراودا کێشاوە و لە هیچ شوێنێکی باسەکەیدا تێکەڵی نەکردون.

مامۆستا تۆفیق وەهبی هەرچەندە لە بەشی جۆری وشەدا ( بڕوانە: کتێبی « قواعد اللغة الكردية » ، الجزء الأول ، الباب الثاني ، بيروت ، ١٩٥٦ . ل ٨١ ــ ٨٢ ؛ وە « دەستوری زمانی کوردێ » ، جزمی یەکەم، بەغدا . ١٩٢٩ ، ل ٢٦ ــ ٢٨ ) باسی وشەی دارێژراوی نەکردوە ، بەلام وشەی لێکدراوی لەگەڵ وشەی دارێژراودا تێکەڵ نەکردوە و ئەو نمونانەی بۆ نیشاندانی وشەی لێکدراو هێناونیەوە جوان و لەبارن.

کەریمی ئەیوبێ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا بە ڕێكوپێکێ جیاوازیان لە نێوان وشەی دارێژراو و لێکدراودا داناوە . . . بەداخەوە بەشێکی زۆر لە زمانناسانی کورد ئەو دوو جۆرە وشەیان تێکەڵ بەیەکتر کردوە .

پاشگر یا هەردوو ( پێشگر و پاشگر ) پێکەوە .

وشەی دارێژراو بە گوێرەی بەشەکانی ئاخاوتن دەتوانرێ دابەش بکرێ بەسەر ئەم جۆرانەدا[٤٣] .

- ١ -

## ناوی دارێژراو[٤٤]

ناوی دارێژراو لە زمانی کوردیدا بە زۆری بە یارمەتیی پاشگر پێك

---

(٤٣) د. نەسرین فەخری لەو ڕایەدایە کە لە زمانی کوردیدا پێشگر و پاشگر تەنیا بە ناو و کردارەوە دەلکێن . بەم بۆنەیەوە نووسیویتی دەڵێ : « ... ئەو پێشگر و پاشگرانە ... دەکرێن بە دوو بەشەوە : بەشێکی دەچێتە سەر ناو ، بەشەکەی تری دەچێتە سەر فرمان ... » ( بڕوانە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٣٤ ) .

لەو ڕایەدام پێشگر و پاشگر بە زۆری دەچنە سەر ناو و کردار ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك جار دەچنە سەر ئاوەڵناو و ئاوەڵکرداریش ... بە وێنە : « بلند ـ بلندی » ؛ « درێژ ـ درێژی »؛ « سپی ـ سپێتی » ؛ « بەرز ـ بەرزایەتی » ؛ « ڕەش ـ ڕەشایی »؛ « زەرد ـ زەردێنە » ؛ « کز ـ کزۆڵە » ؛ « نەرم ـ نەرمین » ؛ « خۆش ـ نەخۆش » ؛ «ڕێك ـ نارێك» ... « بن ـ بنار » ؛ «پێش ـ پێشەکی » ؛ « بەر ـ بەرین » ... ئەم ڕاستییە لە گەلێك شوێنی کتێبەکانی نووری عەلی ئەمین و ، کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ...دا بەرچاو دەکەوێ .

لێرەدا ئەوەش دەخەمە ڕوو کە لە زمانی کوردیدا پاشگر بە زۆری دەچێتە سەر ناو و ئاوەڵناو، پێشگریش بە زۆری دەچێتە سەر کردار.

(٤٤) لەبەر ئەوەی لێرەدا لە باسی دارشتن دەدوێین ، وای بە باش دەزانین دابەش کردنەکەمان بەو جۆرە بێت ـ واتە پێشگر و پاشگرەکان دابەش بکەین بەسەر ئەوانەدا کە ناو و ئاوەڵناو و کردار و ئاوەڵکردار ....ی دارێژراو ساز دەکەن . دەنا دەتوانرێ بە شێوەی دیکەش دابەش بکرێن ، بەوێنە وەك مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی « ڕێزمانی زمانی کوردی »دا کردوویەتی ـ واتە پێشگر و

=

دێ[٤٥] . بۆ ڕۆنانی ناوی داڕێژراو هەندێ پاشگر هەن دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ڕەگی کردار یا ئاوەڵکردار )ی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو :

أ ــ ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ناوی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو :

١ ــ گەر . وەك :

ئاسنگەر ، مزگەر ...

٢ ــ دار[٤٦] . وەك :

گیاندار ، دوکاندار ...

٣ ــ ساز[٤٧] . وەك :

دانساز ، چەخماخساز ...

٤ ــ بەند[٤٨] . وەك :

ناڵبەند ، کەمەربەند ...

---

= پاشگرەکانی بەسەر ئەوانەدا دابەش کردوە کە دەچنە سەر ناو و ئاوەڵناو و کردار ... من لەم شوێنەدا لەسەر ئەو ڕێکەیە ڕۆیشتووم کە مامۆستایان کەریمی ئەیوبێ و سمیرنۆڤا لە کتێبی « دیالێکتی کوردێ موکرێ »دا گرتویانە .

(٤٥) جگە لە چەند حالەتێکی کەم ، کە هەندێ پێشگر بە ڕەگی کردارەوە دەلکێن و ناوی داڕێژراو دروست دەکەن. ئەویش لە (لاپەڕە ٦٤ــ٦٥)ی ئەم نوسراوەدا باسیان لێوە کراوە .

(٤٦) کەریمی ئەیوبێ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لەو ڕایەدان کە ئەم پاشگرە لە ڕەگی کرداری ئێستا ( الفعل المضارع )ی کرداری « داشتن » ( بون ، هەبون )ی فارسییەوە پەیدا بووە . ( بڕوانە : کتێبی ناوبراو ، ل٢٨) .

(٤٧) هەمان سەرچاوە ، دەڵێ : پاشگری ( ساز ) لە ڕەگی کرداری ئێستای « ساختن » ( کردن ، دروستکردن )ی فارسییەوە پەیدا بووە ( بڕوانە : ل ٢٩ ) .

(٤٨) هەمان سەرچاوە ، وا دەگەیەنێ کە پاشگری ( بەند ) لە ڕەگی کرداری ئێستای « بستن »ی ( بەستن ، گرێدان ، داخستن )ی فارسییەوە هاتووە ( بڕوانە : ل ٢٩ ) .

٥ ــ وان/ەوان(٤٩) • وەك :

گاوان ، باخەوان •••

٦ ــ چێ • وەك :

چایچێ ، خانچێ •••

٧ ــ باز(٥٠) • وەك :

سەرباز ، كۆترباز •••

٨ ــ كەر • وەك :

ئانكەر ، سوالكەر •••

٩ ــ مەند • وەك :

دەولەمەند •••

تێبینێ : پاشگرى ( گەر ، دار ، ساز ، بەند ، وان/ەوان ، چێ ، باز ، كەر ، مەند ) بە زۆرێ یارمەتێ دارشتنى ناوێك دەدەن ، كە پێشە و ئیشــى یەكێكى پێ دیارێ بكەن • هەروەها هەندێكیان بۆ مەبەستى دیكەش بەكار دێــن •

---

(٤٩) هێشتا بە تەواوێ ڕۆن نەكراوەتــە كە ئەو بزوێنى (ە)یەى لــە پێــش هەندێ پاشگرەوە دێ ، ڕەسـەنە یاخود پەیوەندییە . وەك : وان/ەوان، وە/ەوە ... لەبەر ئەوە هەردۆ شێوەیان دەنۆسین .

(٥٠) كەریمى ئەیوبێ و ئى. ئا. سمیرنۆڤا ، باسى ئــەو حەوت پاشگرەیان كردوە و وەك گرۆپێكى تایبەتێ جیــایان كردونەوە . ( بڕوانە : كتێبى ناوبراو ، ل ٢٨ ــ ٢٩ ) . مامۆســتا نورى عەلى ئــەمین هەرچەندە بەیەكەوە داىنەناون و وەك گرۆپێكى تایبەتێ جوداى نەكردونەتەوە ، بەڵام هەر یەكەى لە شوێنێكدا باسكردوە .

١٠ـ ێ[٥١] ، وەك :

منداڵێ ، هەلاجێ ...

١١ـ ەتێ ، وەك :

پیاوەتێ ، برایەتێ ...

١٢ـ ێتێ ، وەك :

دزێتێ ، پینەچێتێ ...

١٣ـ ایەتێ ، وەك :

دۆستایەتێ ، دوژمنایەتێ ...

١٤ـ ێنێ ، وەك :

کوڕێنێ ، کچێنێ ...

---

(٥١) ئەمـە پاشکری نـاوی مەعنایە و لـەگەڵ پاشکری سـیفەی نیسبێ جوداوازن ـ واتـە دوو پاشـکری سەربەخۆن و هـەر یەکەیان لـە سەرچاوەیەکەوە هاتوە و ئەرك و دەوری جوداواز دەبینن . وێچوونی شێوەیان بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لـە زماناسان بە یەك پاشکریان دابنێین . شـایانی باسـە مامۆستا مەسـعود محەمەد ، لـە وتاری « بەکارهێنانی (ی) لـە ڕێزمـانی کوردیـدا » گەلێك ڕوی ئـەو دوو پاشکرەی ڕوون کردۆتەوە ( بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ ـ ١٠٢ ) . هەروەها مامۆستا فارۆق عومەر صدیق لە وتاری « وشەسازێ لە زمانی کوردیدا » بە دوور و درێژی لە پەیدابوون و گەشەکردن و دەوریان دواوە و هەرچەندە نوسەر لە چەند شوێنێکی وتارەکەیدا بە هەڵە چووە ، بەڵام بەگشتێ هەندێ زانیاری نوێی لە بارەی ئەو دوو پاشکرەوە تۆمار کردوە (بڕوانە: « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ٢ ، بەعدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤١٧ ـ ٥٢٣ ) .

تێبینی : پاشگری (ێ) و پاشگری ( ەتی / یتی ، ایەتی ، ێنــی )[٥٢] ناوی مەعنەویی دروست دەکەن[٥٣] • ئەو جۆرە ناوانەش مانــای تەجریــد (ئەبستراکت) دەبەخشــن و واتای نەوعیەت و خــاسیەت وکار و جــۆری چالاکی •••یان تێدایە •

١٥ــ گا ، وەك :

کۆگا ، دەزگا[٥٤] •••

---

(٥٢) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە دیــاری کردنی ئەم پاشــگرانەدا (ێ) و (یی) ، بە دوو پاشگر داناوە و وشەی « ئاشەوانی » و « ساوایی » بــە نموونە بۆ هێناونەتەوە . بەڵام مامۆستا لەمــەدا بە هەڵە چووە و یەك پاشگرن ، کە ئەویش ( ێ )یە . حاڵەتی دووەمیان ئەوەیە کــە بە پێی دەستووری فۆنەتیکی کوردی نیمچە بزوێنێك لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا بووە ... هەروەها مامۆستا (ەتی ــ پیاوەتی) و (یەتی ــ نانەوایەتی)یشی بە دوو پاشگر داوەتە قەڵەم. لێرەشدا نوسەر بە هەڵە چووە و ئەوانیش هەر یەك پاشگرن و ئەویش ( ەتی )یە... (بڕوانە : «ڕێزمانی کوردی»، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٧٧ ) .

کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا باسی تەواوی ئەو پاشگرانەیان کردوە ، بەڵام هەڵەی هەرە گەورەیــان ئەوەیە کە پاشگری (ایی)یــان بە ( ای ) ناو هێناوە و سەرەڕای ئەوەش نموونەیان بۆ نەهێناوەتەوە .

(٥٣) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە هەمــان نوسراودا دەڵێ : پاشــگری وا « ناوی مەعنەوی لە ناو پێ دروست ئەکرێ » ( ل ٧٧ ) ... ڕاستە ئەو پاشگرانە ناوی مەعنەوی دروست دەکەن ، بەڵام نوسەر بۆ ئەوە نەچوە کە هەندێکیان دەچنە ســەر ئاوەڵناویش و ناوی لێ دروست دەکەن ، وەك : بڵندی ، سپێتی ، بەرزایوتی ، ڕەشایی ... هتد .

(٥٤) وشەی «دەزگا» لە « دەست + گا » پێکهاتووە . لە سەرێکەوە دەنگی (ت) فوت دراوە ، واتەــ لەمەدا بەر یاسای تواندنەوە( Assimilation ) کەوتووە . لە ســەرێکی دیکــەوە ( گ ) کە کۆنســۆنانتی ئاوازەدار ( Voiced )ە لەگەڵ دەنــگی (ز)دا کە ئەمیــش هــەر کۆنسۆنــانتی ئاوازەدارە پتر دەگونجێ ، وەك لــەگەڵ (س)دا کــە کۆنسۆنانتی کپ ( Breathed )ە . لەم ڕووەوە یاسای تواندنەوە کاری کردوە .

١٦ـ گە ، وەك :

کارگە ، ڕێگە ...

١٧ـ ستان ، وەك :

کوردستان ، دارستان ...

١٨ـ خانە ، وەك :

کتێبخانە ، چایخانە ...

١٩ـ دان ، وەك :

ئاگردان ، گوڵدان ، خەڵوزدان[55] ...

٢٠ـ ەن ، وەك :

پۆشەن ، چیمەن ...

٢١ـ جاڕ ، وەك :

تێرگزەجاڕ ، تووتنەجاڕ ...

٢٢ـ ەوار ، وەك :

شوێنەوار ، لێژەوار ...

تێبینی : پاشگری ( گا ، گە ، ستان ، خانە ، دان ، ەن ، جاڕ ، ەوار) بە شێوەیەکی گشتی شوێن و جێگە نیشان دەدەن[56] .

---

(٥٥) لە شێوەی سلێمانیدا « خەڵوزان » لەگەڵ جۆرە گرتنێکی « ز »ەکەدا تلفظ دەکرێ . دیارە تێچوونی دەنگی ( د ) لەم وشـەیەدا ، هەمـان دیاردەیە کە لە دەیان وشەدا بەرچاو دەکەوێ .

(٥٦) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئـا. سـمیرنۆڤا ، هەرچەندە لـە ژێر ناوی « پاشگری جێگە »دا لـە ( گا ، گە ، ستان ، خانـە ، دان ) دواون ( بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٠ ـ ٣١ ) . بەڵام باسی پاشگری (ەن ، جاڕ ، ەوار )یان نەکردوە ، کە ئەمانیش هەر شـوێن و جێگە نیشـان دەدەن .

٢٣ـ له • وه‌ك :
گۆزه‌له ، دیزه‌له •••

٢٤ـ یله • وه‌ك :
ئه‌نگوستیله ، كاریله •••

٢٥ـ ۆله • وه‌ك :
داتۆله ، مێشۆله •••

٢٦ـ ۆله • وه‌ك :
كیژۆله ، به‌رخۆله •••

٢٧ـ چكه • وه‌ك :
گوێچكه ، زێچكه •••

٢٨ـ ۆكه • وه‌ك :
بزتۆكه ، كه‌پرۆكه •••

٢٩ـ له • وه‌ك :
براله ، مێرۆله •••

٣٠ـ ۆلكه • وه‌ك :
جامۆلكه ، داسۆلكه •••

٣١ـ ۆچكه • وه‌ك :
منداڵۆچكه ، داپیرۆچكه •••

٣٢ـ چه • وه‌ك :
باخچه ، ده‌ریاچه •••

٣٣ـ ۆله • وه‌ك :
به‌رخۆله •••

٣٤ــ ۆڵ • وەك :

ئاسكۆڵ •••

٣٥ــ ۆ • وەك :

پۆشتۆ •••

٣٦ــ ۆك • وەك :

گوندۆك ، تیرۆك •••

٣٧ــ ۆ • وەك :

شێرۆ ، هەورۆ •••

٣٨ــ ەڵ • وەك :

كۆمەڵ •••

٣٩ــ یلكە • وەك :

چاویلكە ، جامیلكە •••

٤٠ــ ۆل • وەك :

مچۆل ، مەجۆل •••

تێبینێ : پاشگری ( لە ، یلە ، ۆلە ، ۆلە ، چكــە ، ۆكە ، لە ، ۆلــكە، ۆچكە ، چە ، ۆلــە ، ۆڵ ، ۆ ، ۆك ، ۆ ۆك ، ەڵ ، یلــكە ، ۆل )[٥٧] بــە زۆرێ بۆ بچۆك كردنەوە یا گەیاندنی مانای نــازدارێ بەكار دەهێنــرێن ،

---

(٥٧) كەریمی ئەیوبێ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لەو هەمۆ پاشگرانەدا تەنیا ناوی ( لە ، یلە ، ۆلە ، ۆلە ، چكە )یان هێناوە (بڕوانە : ل ٣٣) . جگە لەوە لە شوێنێكی تردا ناوی پاشــگری ( چە ، ۆ ، ۆك )یان هێناوە ، بەلام نەیان وتووە كە واتای بچۆك كردنەوەش دەگەیەنن ... مامۆستا نوری عەلی ئەمین بە شێوەیەكی فراوان باسی ئەو پاشگرانەی كردوە ، بەلام تەنیا پاشگری ( لە )ی لە یاد كردوە .

بەڵام هەندێکیان جگە لە واتای بچوك کردنەوە ، مەبەستی کەش دەگەیەنن.

٤١ـ ڵان/ەڵان . وەك :

بەردەڵان ، قامیشەڵان ...

٤٢ـ زار . وەك :

دڵزار ، گوڵزار ...

٤٣ـ ێن . وەك :

هەڵماتێن ، تۆپێن ...

٤٤ـ ێنە . وەك :

نیسکێنە ، ماشێنە ...

٤٥ـ ینە . وەك :

دۆینە ، مەسینە ...

٤٦ـ وانە . وەك :

پـاوانە ، ملوانە ...

٤٧ـ ك ـ ik . وەك :

دەسك ، پەتك ...

٤٨ـ کە . وەك :

لەتکە ، لۆتکە ...

٤٩ـ گار . وەك :

ڕۆژگار ، شەوگار ...

٥٠ـ وەر/ەوەر . وەك :

سەروەر ، جانەوەر ...

٥١ـ ە • وەك :

ئاگرە ، شەوە •••

٥٢ـ ین • وەك :

سەرین(٥٨) ، شەرمێن •••

٥٣ـ ۆر • وەك :

دەستۆر •••

٥٤ـ ەوا • وەك :

نانەوا ، دۆخەوا •••

٥٥ـ انە • وەك :

جەژنانە ، پۆشانە •••(٥٩)

٥٦ـ ەمەنێ • وەك :

شێرەمەنێ ، چاپەمەنێ •••

---

(٥٨) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە وشەی « سەرین »دا « ســەر »ی بە ئاوەڵکردار داناوە ( بڕوانە : « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردیێ »، ل ٢٧ ) . هەرچەندە وشەی « ســـەر » وەك ئاوەڵکردار بەکاردێت ، بەڵام لە وشەی « سەرین »دا ناوە .

(٥٩) لە وشەکانی « جەژنانە ، پۆشانە ، پاکانە ، سۆرانە »دا پاشگری (انە) چووەتە سەر ناو و ئاوەڵناوی سادە و کردۆنیەتە ناوی داڕێژراو . لە وشەکانی « ژنانە ، پیاوانە ، ژیرانە »دا هەرچەندە دیسان پاشگری ( انە ) چووەتە سەر ناو و ئاوەڵناوی سادە ، بەڵام کردۆنیەتە ئاوەڵناو یاخود ئاوەڵکرداری داڕێژراو . سەرەڕای ئەوە واتـا و دەوری ئەو پاشگرە لە کۆمەڵی یەکەمی وشـەکاندا لەگەڵ کۆمـەڵی دووەمدا زۆر جوداوازە . ئەمەش ســەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشــێ کە دۆ پاشگری سەربەخۆ بن ... بێ گومان ئەمەی ئێمە تەنیا بۆچۆنێکی سەرپێیە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە .

٥٧ــ اك • وەك :

پیتاك •••

٥٨ــ ندە • وەك :

باڵندە ، گازندە •••[٦٠] ، [٦١]

•••••• هتد •

بــ ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیکەنە نــاوی داڕێژراو :

١ ــ ی[٦٢] • وەك :

کوێری ، بەرزی ، درێژی ، جوانی •••

٢ ــ ەتی • وەك :

گەورەیەتی ، سپیەتی •••

---

(٦٠) دەربارەی دەور و مەبەستی بەشێك لەو پاشگرانەی سەرەوە هیچمان نەنوسیوە ، یاخود ئەوانەش کە لێیان دواوین شــتێکی زۆر کەمە . ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئێمە مەبەستمان شێوەی داڕشتنی وشەیە . جگە لەوەش ، لەبەرئەوە کە ئەم نوسراوەی ئێمە بۆ مەبەستی خوێندنە، لــە هەنــدێ شــوێندا لێکۆڵیــنەوەی فراوانی تێدا نەکراوە . دەنــا ئەوە دەزانین کە هەر یەکێك لەو پاشگرانەی ئێمە بە دوو دێڕێك لێیان دواوین ، لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل و تایبەتی هەڵدەگرن... بە وێنە بۆ پاشگری (ە) تەنیا دوو نموونەمان هێناوەتەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەزانین ئەو پاشگرە لە زمانی کوردیدا دەوری چەند زۆرە . بێ گومان، وەك وتمان لەبەر ئەوەیە کە لێرەدا وا پێویست دەکات .

(٦١) بۆ لێکدانەوەی ئەو پاشگرانە و هێنانەوەی هەندێ نموونە ، سوودێکی زۆرم لە نوسراوەکانی نوری عەلی ئەمین و کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا وەرگرتووە .

(٦٢) ئەمە پاشگری ناوی مەعنایە . چۆن دەچێتە سەر ناو و ناوی مەعنەوی لێ دروست دەکا ، هەر بەو جۆرەش دەچێتە سەر ئاوەڵناو و نــاوی مەعنەوی پێك دێنێ .

٣ ـ ێتی[٦٣] ، وەك :

سپێتی ، بەرزێتی ...

٤ ـ ایەتی ، وەك :

بڵندایەتی ، کەمایەتی ...

٥ ـ ایی ، وەك :

قوڵایی ، پانایی ، تاریکایی ...

٦ ـ ە ، وەك :

خراپە ، چاکە ، ڕاستە ، بەندە ...

٧ ـ ڵان/ەڵان ، وەك :

نەرمەڵان ، سەوزەڵان ...

٨ ـ ێنە ، وەك :

زەردێنە ، سپێنە ...

٩ ـ کە ، وەك :

پیسکە ، ڕەشکە ...

١٠ـ ك ـ ik ، وەك :

ئەستورك ، گەرمك ...

١١ـ ان ، وەك :

ڕەقان ، نەرمان ، سوران ...

١٢ـ انە ، وەك :

پاکانە ، سورانە ...

---

(٦٣) پاشگری (ەتی) و (ێتی) هەردوکیان هەر یەك پاشگرن ، بەڵام هەرچی (ەتی)یە ڕلستترە و زۆریش بەکاردێ ، کەچی (ێتی) بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی باوە .

١٣ـ ەن • وەك :

ڕۆتەن ، تیژەن ، ڕەقەن •••

١٤ـ ەك • وەك :

بەرزەك •••

١٥ـ ین • وەك :

نەرمین(٦٤) •••

١٦ـ ندە • وەك :

دڕنــدە •••

١٧ـ ەمەنێ • وەك :

ساردەمەنێ ، مزرەمەنێ •••

حـ ـ ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر کرداری ســادە و دەیکەتە نــاوی داڕێژراو :

هەندێ پاشگر بە ڕەگی کرداری ڕابوردو و ئێستاو و ناوی چــاوگ (اسم المصدر)ەوە دەلکێن و ناوی داڕێژراوی لێ دروست دەکەن ، وەك :

١ ـ ار • وەك :

« وتار » لە « وتن »ەوە •

« کوشتار » لە « کوشتن »ەوە •

٢ ـ یار • وەك :

« پرسیار » لە « پرسین »ەوە

« کڕیار » لە « کڕین »ەوە •

---

(٦٤) مامۆستا نوری عەلی ئەمین وشەی « نەرمین »ی بە ئاوەڵناو داوەتە قەڵەم ( بڕوانە : « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردێ» ، ل ٢٧ ). من وای بۆ دەچم کە « نەرمین » ناوە و ناوێکی تایبەتێ ( اسم العلم )ە.

٣ ـ ەر ، وەك :

« تۆسەر » لە « تۆسین »ەوە ،
« دانەر » لە « دانان »ەوە ،

٤ ـ مسان ، وەك :

« درۆمان » لە « درۆن »ەوە ،
« نیشتمان » لە « نیشتن »ەوە ،

٥ ـ ۆکە ، وەك :

« فڕۆکە » لە « فڕین »ەوە ،

٦ ـ ە ، وەك :

« بازە » لە « بازان »ەوە ،
«کۆکە» لە «کۆکین»ەوە ،

٧ ـ گە ، وەك :

«لەوەڕگە» لە «لەوەڕان»ەوە ،
«بڕگە» لە «بڕین»ەوە ،

٨ ـ ەن ، وەك :

«زێژەن» لە «زژان»ەوە ،
«ستوتەن» لە «ستوتان»ەوە ،

٩ ـ ەك ، وەك :

«کوتەك» لە «کوتان»ەوە ،

١٠ـ اك ، وەك .

«خۆراك» لە «خواردن»ەوە ،

١١ــ وه/هوه • وهك :

«كردهوه» له «كردن»هوه •

١٢ــ كه • وهك :

«فڕكه» له «فڕین»هوه[٦٥] •

١٣ــ هوار • وهك :

«خوێندهوار» له «خوێندن»هوه[٦٦] •

١٤ــ نده • وهك :

«كوشنده» له «كوشتن»هوه •

«فڕنده» له «فڕین»هوه •

١٥ــ مهنیَ • وهك :

«سوتهمهنیَ» له «سوتان»هوه•

---

(٦٥) كهریمی ئهیوبیَ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لهم بارهیهوه تهنیا باسی پاشگری (ار ، یار ، هر ، مان)یان كردوه ( بڕوانه : ســهرچاوهی ناوبراو ، ل ٣٨ ــ ٣٩ ) . مامۆستا نوری عهلی ئهمینیش له بهشێكیان كۆلیوهتهوه ( بڕوانه : كتێبی « گرتنی كهلێنێكی تر له ڕێزمانی كوردیَ » ) . بهلاّم لیژنهی زمان و زانستهكانی كوڕ له زوربهیان دواوه ( بڕوانه : ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردیَ به پێی لێكۆلینهوهی لیژنهی زمان و زانستهكانی ، « گۆڤاری كوڕی زانیاری كورد » ، بهرگی چوارهم ، ل ٣٨٠ ــ ٤٠٠).

(٦٦) مامۆستا نوری عهلی ئهمین لــه وشـهی « خوێندهوار ، كوردهوار ، شوێنهوار »دا ، (هوار)ی بــه یهك پاشــكر داناوه ( بڕوانــه : كتێبی « گرتنی كهلێنكی تر له ڕێزمانی كوردیَ » ، ل ٢٤ ) . لێكدانهوه ئهوه ڕوَن دهكاتهوه كه له وشـهی «شوێنهوار ، كوردهوار»دا واتای شوێن و جێكه ههیه . بهلاّم ئهو پاشكره له وشـهی « خوێندهوار »دا به جۆرێكی دیكه خۆی دهنوێنیَ ... ئهمهش سهرنج بۆ ئــهوه ڕادهكێشــیَ كه دوَ پاشكری جودا بن . وهك ( یَ )ی ناوی مهعنا و (یَ)ی سفهی نیــبیَ . بیَگومان ئهمه تهنیا بیركردنهوهیهكه ؛ ئهگینا پێویــستی به لێكولینهوهی زانستیَ و مێژوَییَ ههیه .

«خواستەمەنی» لە «خواستن»ەوە •
•••••• هتد[٦٧] •

د ـ ئەو پاشگرانەی دەچنە سـەر ئاوەڵکرداری سـادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو :

١ ـ ین • وەك :
پێشین •••

٢ ـ ار • وەك :
بنـار •••

٣ ـ ەوا • وەك :
پێشەوا •••

جگە لەوە هەندێ پێشـگریش هەن ، کە بە ڕەگی کردار یا نـاوەوە دەلکێـن و ناوی داڕێژراو دروست دەکەن :

١ ـ پێ • وەك :
«پێویست» لە «ویستن»ەوە •
«پێخەف» لە «خەفتن»ەوە •

٢ ـ ڕا • وەك :
«ڕایەخ» لە «خستن»ەوە •

٣ ـ بەر • وەك .
«بەرچنە» لە «چنین»ەوە •
«بەرکوت» لە «کوتان»ەوە •

---

(٦٧) ئەو ناوانەی لە کردارەوە دروست دەبن لە زانسـتی زماندا بە ناوی کرداری Verbal noun ( substantive ) ناسراون .

٤ ــ هاو • وەك :
هاوولآت ، هاوڕێ ، هاوژین •••
••••••• هتد •

ــ ٢ ــ

## ئاوەڵناوی دارێژراو

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناوی دارێژراو بە یارمەتی پێشگر و پاشگر ساز دەبێ • بۆ ڕۆنانی ئاوەڵناوی دارێژراو هەندێ پێشگر و پاشگر هەن کە دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار )ی سادە و دەیانکەنە ئاوەڵناوی دارێژراو :

أ ــ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ناوی سادە و دەیکەنە ئاوەڵناوی دارێژراو :

لە زمانی کوردیدا دوو پێشگر هەن ، دەچنە سەر ناو و ، ئاوەڵناوی لێ دروست دەکەن • وەك :

١ ــ بێ • وەك :
بێهۆش ، بێکار •••

٢ ــ بە • وەك :
بەهێز ، بەجەرگ •••

ئەو پاشگرانەی ئاوەڵناو لە ناو ساز دەکەن زۆر نین • هەندێ پاشگر هەن چۆن ناو پێكدەهێنن ، هەروەها ئاوەڵناویش دروست دەکەن ، واتە گشتین بۆ ناویش و ئاوەڵناویش •

ئەو پاشگرە سەرەکیانەی ، ئاوەڵناو لە ناو دادەڕێژن ئەمانەن :

١ ــ ێ • وەك :

جیهانێ ، زستانێ ، بەهــارێ ، هەولێرێ ، هەورامێ ...[٦٨]

٢ ــ ن — in • وەك :

ورگن ، تۆکن ، شەرمن ، گۆشتن •

---

(٦٨) ئەمە پاشگری ســیفەتی نیســبی‌یە . لە پەراوێزی ژمارە ( ٥١ )دا پەنجەمان بۆ ئەوە ڕاکێشا کە (ێ)ی پاشگری سیفەی نیســبی لەگەڵ پاشگری (ێ)ی ناوی مەعنادا جیاوازن و وێچوونی شێوەیان بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لە زمانناسـان بە یەك پاشگریــان دابنێن . ئــەوەی پتر جێگەی سەرنج بێ ئەوەیــە ، نــەك ئەوانەی کە بــە یــەك پــاشگری تێ‌گەیشتوون ، بەڵکو بەشێك لەوانەی جودایان کردۆنەتەوە ، بەتایبەتی زانایانی مەدرەسەی یەکێتی سۆڤێت لەو ڕایەدان کە ، (ێ)ی پاشگری سیفەی نیسبی ئەگەر چوە سەر ناوێك ، وەك (هەولێرێ ، بەغدایی ، لێنینگرادێ ...) و مەبەست لە کەسێك بێت کە خەڵکی ( هەولێــر ، بەغدا ، لێنینگراد ... ) بێت ناوێکی نیسبییە . بەڵام هاتۆ مەبەست لە شتێك بۆ ئەو دەمە سیفەتی نیســبییە ( بڕوانە : قەناتی کوردۆ ، دەســتوری زمــانی کوردێ ، مۆســکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٢٩٦ ــ ٢٩٧ ؛ چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ ، ل ٢٤٤ ــ ٢٤٥ ؛ کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٣٩ ــ ٤٠ ؛ فارۆق عومەر صدیق ، وشەسازی لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥١٤ ــ ٥١٥ ؛ ...) . لەو ڕایەدام کە نوسەرانی ناوبراو لەم بۆچــونەدا بە هەڵە چوون ، چونکە وشــەی ( هەولێرێ ، بەغدایی ، لێنینگرادێ ... ) سیفەتی نیسبین. بۆ ڕەت کردنەوەی ئەو ڕایە مامۆستا مەســعود محەمەد ڕاســتی بۆ چووە کە دەڵێ : « هیچ فەرقێك نیە لەوەدا پیاوێك بەغدایی بێت وە یا شەربەی ئاو بەغدایی . کاتێك ( بەغدایی ) دەبێتە ناو کە بکرێ بە ( اسـم علم ) بۆ یەکێکی دیــار کراو ، لێرەشدا فەرق نییــە ناوەکە بۆ ( شێرێکی باغچەی جانەوەران ) بێت یاخود بۆ ( کابرایێکی گەڕەکی جدیــد حسن پاشا ) بێت . کەواتە ڕاست نیە بڵێین وشەی ( بەغدایی ) کە بۆ مرۆڤ بۆ دەبێتە ناوی نیسبی . لە ڕستەی ( کابرایێکی بەغدایی مەلەی کرد ) وشەی ( بەغدایی ) ســیفەتە هەرچەند بۆ کەسیش بەکار هــاتوە کــە =

٣ ــ ێن • وەك :

زێڕێن ، ئاگرێن ، بەفرێن •

٤ ــ ۆڵ • وەك :

کرمۆڵ •••

٥ ــ وەر/ەوەر • وەك :

بەختەوەر •••

٦ ــ دار • وەك :

ئاگادار •••

---

=

دانیشتوی بەغدایە . بەپێچەوانە ، کە کەڵەشێرێکت هەبۆ ناوی ( بەغدایی ) بۆ ئەوسا وشەکە لە سیفەت دەشۆرێ و دەبێتە (اسم علم) هەرچەند کەڵەشێر کەسیش نییە». بۆ ئەم چەند دێڕە بڕوانە ل ٥١٥ی وتاری فارۆق عومەر صدیق کە لە گۆڤاری ناوبراوی کۆڕدا بڵاوکراوەتەوە ) . سەرەڕای ئەو ڕاستییەی مامۆستا مەسعود نیشانی داوە و گومانی لەو باسەدا نەهێشتوە ، ئێمەش وا بیر دەکەینەوە کە هۆی ئەو هەڵەیەی زانایانی ناوبراو وەرگێڕانی ئەو دۆ حاڵەتەیە بۆ سەر زمانی ڕۆسی . ئەگەر (ێ)ی پاشگری سیفەی نیسبی چوە سەر ناوێك و مەبەست لە کەسێك بۆ ، ئەوە لە زمانی ڕۆسیدا بەرانبەری پاشگری ( یتس ) دەوەستێ ... بەڵام ئەگەر پاشگری ( ێ )ی سیفەی نیسبی چوە سەر ناوێك و مەبەست شتێك بۆ ، ئەو دەمە لە زمانی ڕۆسیدا بەرانبەری پاشگری ( سك ) دادەنرێ . جا بەر لە هەمۆ شتێك دەبێ ئەوە لەیەك جودا بکەینەوە کە لە ڕۆسیدا دۆ پاشگر ئەو دەورە دەبینن ، نەك یەك پاشگر وەك لە کوردیدا . پاشگری ( یتس )ی ڕۆسی پاشگرێکە ناو دروست دەکات ، نەوەك وەك (ێ)ی سیفەی نیسبی کوردی کە هەر ئاوەڵناو دادڕێژێ . پاشگری ( یتس ) لە ڕۆی مەبەستەوە هەندێ جوداوازێ لەگەڵ پاشگری ( ێ )ی سیفەی نیسبیدا هەیە . هەر زمانێکیش خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی ...

٧ ـ كار . وەك :

داواكار ...

٨ ـ ێ . وەك :

كرمێ ...

٩ ـ انە . وەك :

ژنانە ، پیاوانە ، منداڵانە....(٦٩)

١٠ـ ەكێ . وەك :

خێڵەكێ ، دەشتەكێ ، سەرەكێ

١١ـ انێ . وەك :

ژنانێ ، كچانێ ، شەڕانێ

١٢ـ ناك . وەك :

غەمناك ، ترسناك

١٣ـ ە . وەك :

هاوینە ، بەهارە ...(٧٠)

١٤ـ ۆر . وەك :

ڕەنجۆر ...

---

(٦٩) بڕوانە پەراوێزی (٩٣) .

(٧٠) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لەو ڕایەدایە كە وشەی ( هاوین ، بەهار .... ) ئاوەڵكردرن و كاتێك پاشگری (ە)یان پێوە دەلكێ دەبنە ناو ( بڕوانە : كتێبی « گرتنی كەلێنێكی تر لە ڕێزمانی كوردێ» ، ل ٨). من لەو ڕایەدا'م كە ئەو وشانەی ناومان بردن هەرچەند وەك ئاوەڵكرداریش بەكار دەهێنرێن ، بەڵام بەر لە هەمۆ شتێك ناوی كات (اسم الزمان)ن و بە یارمەتێ پاشگری (ە) دەبنە ئاوەڵناو ، نەك ناو .

١٥ـ اوی • وەك :

ئارداوی ، شاخاوی ، خۆڵاوی ...(٧١)

١٦ـ دار • وەك :

ناودار ، نازدار ...

١٧ـ باز • وەك :

مێباز ، فێڵباز ...(٧٢)

ب ـ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :

پێشگری (نە) و (نا) دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و ئاوەڵناوی داڕێژراوی لێ دروست دەکەن :

١ ـ نە • وەك :

نەخۆش ، نەساخ ...

---

(٧١) مامۆستا نوری عەلی ئەمین باسی ئەو پاشگرەی کردوە و ژمارەیەك نمونەی بۆ هێناوەتەوە ، وەك : « کرماوی ، شاخاوی ، قوڕاوی ، خوێناوی ... » ( بڕوانە : کتێبی « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی » ، ل ٢٨ ) . بەداخەوە هەندێ لە نمونەکانی لەبار نین و تیایاندا بە هەڵەچوە . ڕاستە لە وشەی «کرماوی ، شاخاوی...»دا ، (اوی) پاشگرە ، بەڵام لە وشەی « قوڕاوی ، خوێناوی ... »دا ، ( اوی ) پاشگر نیە ، بەڵکو بریتییە لە وشەی « او » و پاشگری (ی)ی سیفەی نیسبی . « کرماوی ، شاخاوی ... » وشەی داڕێژراون لە وشەیەکی سادە و پاشگرێك پێکهاتون . هەرچی « قوڕاوی ، خوێناوی ... »یە وشەی لێکدراون و لە دوو وشەی سادە و پاشگرێك دروست بوون .

(٧٢) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ئەو وشانەیان بە ناو داناوە ( بڕوانە : کتێبی ناوبراو ، ل ٢٨ ) . لەو ڕایەدام کە وا لەمەدا بە هەڵە چوون .

٢ ــ نا ، وەك :

نارێك ، ناپاك ...

ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و ئاوەڵناوی داڕێژراویان لێ دروست دەکەن ئەمانەن :

١ ــ انێ ، وەك :

تەختانێ ، ڕەقانێ ، نەرمانێ ...

٢ ــ ۆ ، وەك :

بۆزۆ ، پیسۆ ...

٣ ــ ۆر ، وەك :

مەستۆر ...

٤ ــ ۆکە ، وەك :

پیسۆکە ، گیلۆکە ...

٥ ــ ەلە ، وەك :

نەرمەلە ، سەوزەلە ...

٦ ــ ۆلە ، وەك :

نەرمۆلە ، شڕۆلە ...

٧ ــ ۆڵ ، وەك :

نەرمۆڵ ، شڕۆڵ ...

٨ ــ یل ، وەك :

وردیل ، گردیل ...

٩ ــ کەلە ، وەك :

سورکەلە ، جوانکەلە ...

١٠ــ یلکە ، وەك :
سپیلکە ، خشتیلکە ...

١١ــ ولکە ، وەك :
بەرزۆلکە ، تەختۆلکە ...[٧٣]

١٢ــ اك ، وەك :
ڕۆناك ...

ج ــ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ڕەگی کردار یاخود ناوی چاوگ و دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :

پێشگر :

١ ــ نە ، وەك :
نەمر ، نەبەز ، نەزان ...

پـاشگر :

١ ــ ۆك ، وەك :
لەرزۆك ، گەڕۆك ...

٢ ــ ەك ، وەك :
ڕووەك ، ترسەك ...

٣ ــ ار ، وەك :
«دیار» لە «دیتن»ەوە .

---

(٧٣) هەرچەندە ئەو چەند پاشگرە بۆ بچوك کردنـەوەی ئـاوەڵنـاو بەکـار دەهێنرێن و ئاوەڵناوی داڕێژراو سـازدەکەن ، بەڵام هـەندێ لـەو ئاوەڵناوە داڕێژراوانە دەتوانن خۆیان وەك ناویش بنوێنن ، بە وێنـە : بەرزۆلکە ، مزرۆکە .... هتد .

٤ ـ ا ٠ وەك :

«زانا» لە «زانین»ەوە ٠

٥ ـ ۆ ٠ وەك :

«مردۆ» لە «مردن»ەوە ٠

د ـ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵکرداری سادە و دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :

پاشگر :

١ ـ ەکێ ٠ وەك :

سەرەکێ ، پێشەکێ ٠٠٠

٢ ـ ۆ ٠ وەك :

سەرۆ ، خوارۆ ٠٠٠

٣ ـ ێن ٠ وەك :

بەرێن ٠٠٠

ـ ٣ ـ

## کرداری داڕێژراو

لە زمانی کوردیێدا کرداری داڕێژراو بە یارمەتێ پێشگر و پاشگر پێكدێ[٧٤] ٠ بۆ ڕۆنانی کرداری داڕێژراو هەندێ پێشگر و پاشگر هەن ،

---

(٧٤) هەرچەندە کرداری داڕێژراو بە یارمەتێ پێشگر و پاشگر پێكدێ ، بەڵام لەم کارەدا پێشگر دەوری گرنگترە .

دەچنە سەر (کردار)ی سادە و دەیکەنە کرداری دارێژراو[٧٥] •

أ ــ پێشگر •

ئەو پێشگرانەی کرداری دارێژراو ساز دەکەن دوو جۆرن :

یەك ــ پێشگری سادە • وەك :

١ ــ دا • ئەم پێشگرە گەلێك مانا دەبەخشێ و بە زۆری بزووتنەوەی بەرەو خوار نیشان دەدات • وەك :

دابەزین ، داگرتن ، داتەکاندن •••

٢ ــ ڕا • مانای جۆراوجۆر دەبەخشێ ، وەك لەو نموونانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێن :

ڕاهاتن ، ڕاتەکان ، ڕاگرتن •••

٣ ــ هەڵ • ئەم پێشگرە بە زۆری بۆ بزووتنەوەی بەرەو ژوور بەکاردێت ، بەڵام هەندێ جار مەبەستی تریش دەگەیەنێ ، وەك :

هەڵماڵین ، هەڵچوون ، هەڵگەڕان •••

٤ ــ ڕۆ • ئەم پێشگرە بەگشتی بزووتنەوە بەرەو خوارەوە ، یاخود ناوەوە نیشان دەدا ، وەك :

ڕۆکردن ، ڕۆچوون •••

---

(٧٥) هەرچی ناو و ئاوەڵناوی دارێژراوە بە یارمەتی پێشگر و پاشگر لە ( ناو و ئاوەڵناو و کردار و ئاوەڵکردار )ی سادە دروست دەکرێن . بەڵام بۆ ڕۆنانی کرداری دارێژراو پێشگر و پاشگر هەر بە (کردار)ەوە دەلکێن ، جگە لە پاشگری (اندن) کە دەچێتە سەر ناوی دەنگە سروشتییەکان و هەندێ ناوی دیکە و دەیانکاتە چاوگ و کردار .

٥ ــ وەر(٧٦). مانای پێچکردنەوە و گەڕانەوە و هەڵگێڕانەوە...ی تێدایە . وەك :

وەرگێڕان ، وەرچەرخان ، وەرگرتن ...

٦ ــ ڕێ . وەك .

ڕێخستن ، ڕێخشاندن ....

٧ ــ پێ . وەك :

پێکەنین ، پێگەیشتن ، پێزانین ، پێناسین ...

٨ ــ تێ . وەك :

تێکردن ، تێگەیشتن ، تێگرتن ...

٩ ــ لێ(٧٧) . وەك :

لێخوڕین ، لێدان ، لێنان ...

١٠ــ وێ(٧٨) . وەك :

وێچوون ، وێکەوتن ...

١١ــ ڤێ(٧٩) . وەك :

ڤێچوون ...

---

(٧٦) تایبەتێتی پێشگری ( هەڵ ، ڕۆ ، وەر ) لەوەدایە کە لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا هاوبێژیان نییە .

(٧٧) هەرچی پێشگری (پێ ، تێ ، لێ)یە پەیوەندییان لەگەڵ (پرێپۆزیشن)دا هەیە . بە شێوە لەوە دەچێ کە پاشگری (ڕێ)ش هەر وەك ئەوان بێ ، بەڵام ڕاستیی لە ناوەڕۆکدا هێشتا هیچمان بۆ ئاشکرا نەبووە .

(٧٨) پێشگری (وێ) لە شێوەی موکریدا بە گشتی و لە هەندێ شێوەی دیکەی کرمانجیی خوارۆدا بەکاردێت .

(٧٩) پێشگری (ڤێ) لە دیالێکتی کرمانجیی ژۆرۆدا بەکار دێت ... لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی خوارۆدا دەبێتە (وێ) .

١٢ـ ڤە ، وەك :

ڤەخارن . ڤەكوشتن ...[٨٠]

.........هتد[٨١] .

---

(٨٠) لیژنەی «زمان و زانستەكانی» كۆڕی زانیاری كورد بە شێوەیەكی زانستی و بە نموونەی جوان و لەبارەوە باسی ئەو پێشگرە سادانەی كردوە و دەوری هەر یەكێكیانی دیاری كردوە . بەڵام بەداخەوە لیژنەی ناوبراو پێشگری (ڕۆ) و (ڕێ)ی كە ئەمانیش لە زۆنانی كرداری دارێژراودا دەورێكی گرنگ دەبینن . لە یاد كردوە و بە هیچ جۆرێك ناوی نەهێناون ( بڕوانە : « گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد » . بەرگی چوارەم ، بەغدا . ١٩٧٦ . ل ٣٦٩ ـ ٣٧٣ ) .

كەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا باش لە تێكڕای ئەو پێشگرانە دواون ( جگە لە «ڤە» و «ڤێ» كە سەر بە دیالێكتی كرمانجی ژووروون) . بەڵام كەم و كورتی ئەمان لەوەدایە كە پێشگری ( ڕێ . پێ . لێ . تێ)یان بە ناسادە داناوە .

ئەو پێشگرە سادانەی لە سەرەوە لێیان دواین . لە نووسینەكانی مامۆستا نوری عەلی ئەمیندا باسیان لێوە نەكراوە . تەنیا ئەوە نەبێ كە لە لاپەڕە ١٥٦ ـ ١٥٧ی كتێبی «ڕێزمانی كوردی»دا (هەڵ . دا . ڕا ، ڕۆ ... ) بە ئاوەڵكردار دانراوە و ( پێ ، تێ ، لێ )یش بە پیتی پەیوەندی دراوەتە قەڵەم . ڕاستە ( پێش ، سەر ، لا . بەر ...) وەك ئاوەڵكردار و پێشگر خۆیان دەنوێنن ، بەڵام (هەڵ ، دا ، ڕا . ڕۆ...) هەر پێشگرن و هیچ دەمێك نابنە ئاوەڵكردار . هەرچی ( پێ . تێ . لێ )یشە پەیوەندییان بە (پرێپۆزیشن )ەوە هەیە ، بەڵام بەر لە هەمووشتێك پێشگرن .... سەرەڕای ئەو كەم و كورتییە ، نووسەر لە كتێبی «گرتنی كەلێنێكی تر لە ڕێزمانی كوردی »دا ( ل ٥٣ ـ ٥٦ ) هەندێ نیشانەی ، وەك ( ئە ـ دە )ی موزارەعەت و ( ب )ی فەرمانی بە پێشگر داناوە .

(٨١) لە زمانی كوردیدا هەندێ وشە هەن ، وەك : (دەر ، بەر ، سەر ، لا ، پێش ، پاش ، دوا ، ژێر ، بن ... ) لە پێش كردارەوە دێن و واتای تازە پێك دێنن ... جا بەشێك لە كوردناسان ئەمانە بە پێشگر دادەنێن و بەشێكی دیكەیان بە وشەی واتاداریان دەدەنە قەڵەم .

بە ،ێنە كەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا بە پێشگریان دادەنێن و دەڵێن : « ئەم پێشگرانە ئەوانەن كە لە شێوەی ناو و

=

دوو ـ پێشگری ناساده •

پێشگری ناسادەش دوو جۆره :

أ ) ئەوانەی له ئەنجامی یێکەڵ بوونی پێشگری سادەی ( پێ ، تێ ، لێ ) لەگەڵ پۆستپۆزیشنی ( دا ڕا ، وه )دا دروست بوون • وەك :

١ ــ پێدا • وەك :

پێدادان ، پێدابردن ، پێداچوون •••

٢ ــ تێدا • وەك :

تێداچوون ، تێدابوون •••

٣ ــ پێوه • وەك :

پێوەنان ، پێوەدان ، پێوەکردن •••

٤ ــ تێوه • وەك :

تێوەگلان ، تێوەچوون •••

٥ ــ پێڕا • وەك :

پێڕاگەیشتن ، پێڕاگەیاندن •••

---

=

ئاوەڵکردارد! هاوبێژ ( مشترك لفظي ــ Homonym )یان هەیە»(بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٠٨ ) ... مامۆستا نوری عەلی ئەمین وەك پێشگر ناوی نەبردون بەڵام وەك ئاوەڵکردار لێیان دواوه ( بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٥٧ )... لیژنەی « زمان و زانستەکانی »ی کۆڕ هەرچەندە لەو کێشەیه دواوه ، بەڵام ڕای خۆی نەداوه ( بڕوانە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی چوارەم ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٧٢ )... به باوەڕی من ئەمانه بەر له هەموو شتێك وشەی واتاداران . بەڵام دەتوانن وەك پێشگریش خۆیان بنوێنن . به وێنه (بەر) له وشەی لێکدراوی «بەرماڵ»دا یاخود له ڕستەی « نەسرین چووه بەر هەتاوەکه ...»دا وشەیه . بەڵام له وشەی «بەربوون» و «بەردان »...دا پێشگره .

٦ ــ تێڕا • وەك :

تێڕاکردن ، تێڕابردن •••

٧ ــ لێڕا[٨٢] وەك :

لێڕابردن ، لێڕاهاتن •••

••••••••• هتد[٨٣] •

ب) ئەو پێشگرە ناسادانەی کە لە ئەنجامی تێکەڵ بونی پریپۆزیشنی (دە ، بە ، لە ، وە ، ڕە) لەگەڵ ژمارەی (یێك ، یەك ) پەیدابوون • وەك :

١ ــ پێك • وەك :

پێکهێنان ، پێکهاتن •••

٢ ــ تێك • وەك :

تێکچون ، تێکشکان •••

٣ ــ لێك • وەك :

لێکدان ، لێکبون •••

٤ ــ وێك • وەك :

وێککەوتن ، وێکخستن •••

٥ ــ ڕێك • وەك :

ڕێکبون ، ڕێکخستن •••

••••••• هتد [٨٤] •

---

(٨٢) پاشگری (تێڕا) و (لێڕا) سەر بە دیالێکتی موکرین .

(٨٣) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا باسی ئەو پێشگرانەیان کردوە... بەڵام لەو ڕایەدان کە وا ئەو پێشگرانە لە ئەنجامی بونە پێشگری هەندێ ئامرازەوە پەیدابوون . ( بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١١٤ ) .

(٨٤) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا بە دوور و درێژی باسی تێکڕای ئەو پێشگرە ناسادانەیان کردوە و نمونەی جوان و لەباریان بۆ هێناونەتەوە.

=

هەر یەك لەو پێشگرانەی دەچنە سەر چاوگێكی سـادە ، دیمەن و واتایان دەگۆڕن ، واتە : ١ـ لە ڕۆی پێكهاتنەوە دەبنە داڕێژراو ؛ ٢ـ لە ڕۆی ماناشەوە گۆڕانێك دێتە گۆڕێ • بە وێنە « دان » بە مانای ( بەخشینی شتێك بە كەسێك ) دێت ، هەرچێ « دادان »ە مانای ( ١ـ تیژكردنی سەری دار و قەڵەم ؛ ٢ـ چۆنـە خوارەوە و لێچۆنی شتی شـل « گۆزەكە ئاو دادەدا » ؛ ٣ـ فێركردن « دەرس دادان » •••• ) دەگەیەنێت ••• وشەی «كردن» مانـای ( بەجێهێنانی كارێك )ە ، كەچی « هەڵكردن » مانـای ( بەرزكردنەوەی ئاڵا یا داگیرساندنی چرا •••• ) دەبەخشـێت • یاخود وشەی « گەڕان » واتای ( هاتوچۆ كردن ) دەدات ، بەڵام كـە پێشـگری (لێ)ی پێوە دەلكێ « لێگەڕان » پەیدا دەبێ و مانـای ( وازهێنان ) دێتە كایەوە •••• هتد •

ب ـ پاشـگر •

لە زمانی كوردیدا دۆ پاشـگر هەن، كرداری داڕێژراو دروست دەكەن :

١ ـ ەوە / وە ـ ڤە[85] •

---

=

( بڕوانە : سـەرچاوەی ناوبراو ، ل ١١٤ ـ ١١٨ ) ... هەرچێ لیژنەی « زمان و زانستەكانی »ی كۆڕە ، بەداخـەوە تەنیـا چـەند دێڕێكـی دەربارەی ئەم باسە نۆسیوە و بایەخی پێ نەداوە . ( بڕوانە : سـەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٧٢ ) .

(٨٥) ئاشكرایە كە (ەوە/وە ) لە دیالێكتی كرمانجێ خوارۆدا پاشگرە ، بەڵام پێویسـتە سـەرنج بۆ ئەوە ڕابكێشـین كە ئەم ( ەوە/وە )یە لە كرمانجـێ ژۆرۆدا خۆی وەك پێشگر دەنوێنێ . لەبەر ئەوە دەتوانـین ( ەوە/وە ) نەك تەنیا بە پاشگر ، بەڵكو لە هەمان كاتدا بە پێشـگریش دابنێین . وەك:

خواردن ـ خواردنەوە ـ ڤەخارن

گەڕان ـ گەڕانـەوە ـ ڤەگەڕان

ئەم پاشــگرە دەورێكی گەورە و گرنــگ دەبینێ و گەلێك واتــا دەگەیەنێ و دەیان وشەی نوێ پێكدێنێ • واتا سەرەكییەكانی ( گۆڕینی مەفهومی وشە ؛ گۆڕینی واتای وشە ؛ گەڕانەوە؛ دووبارە بونەوە•••)ن[٨٦]•

(٨٦) دەربارەی ئەم پێشگر و پاشگرە د. نەسریــن فەخری لە ژێــر نــاوی « پاشگر و پێشگری : (ڤە ــ یان ــ وە) لە زمانی كوردیدا»دا (گۆڤاری كۆڕی زانیاری●كورد ، ب١ ، ژ١ ، بەغــدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٣٤ ــ ٢٧٣ ) وتارێكی بڵاوكردۆتەوە و تیایدا بە درێژی و بە بەڵگەوە لە واتا و دەور و پێكهاتن و . . .ی دواوە و گەلێك ڕووی ئەو كێشەیەی ڕوونكردۆتەوە. . . دوا بە دوای ئەم وتارە مامۆستا شــێخ محەمەدی خــالیش بە نــاوی « پێشگر و پاشگر »ەوە ( گۆڤــاری كۆڕی زانیــاری كورد ، ب٢، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٥٦ ــ ٢٧٩ ) و عەمید ئەحمەد حەســەنیش لە بەشی یەكەمی بەرگی سێیەمی هەمان گۆڤاردا ( ل ٣٩١ ــ ٣٥٧ ) هــەر لە ژێر ناوی « پێشــگر و پاشــگر »دا لــەو باســە كۆلیونەتەوە . مامۆستایانی ناوبراویش لەو ڕووەوە هەندێ ڕای جــوان و لەباریــان دەربڕیوە . . . جگە لەو سێ مامۆستایە ، هەروەها زۆتر مامۆستایان : نوری عەلی ئەمین، قەناتی كوردۆ ، مەكەنزی. . . ش لەو باسە دواون.

ئەوەی لەم بارەیەوە پێویستە پەنجەی بۆ ڕابكێشــین ، ئەوەیە كەوا زۆربەی نوسەران بە ( ەوە ) و ( وە )یان داناوە . . . هەرچی د. نەسرین فەخری‌یە لەو ڕایەدایە كە ئەم پاشگرە تەنیا شێوەی ( وە )ی هەیە . بەڵگەشی ئەوەیە كە لە شێوەی كرمانجی ژوروودا كاتێك دەبێتە پێشگر ( ڤــە ) بەكاردێت . بزوێنی ( ە )ش بە پیتێكی پــەیوەندی دادەنێ كە گوایا یارمەتی لكاندنی پاشگری ( وە ) بە پیتی كۆنســۆنانتی پێش خۆیەوە دەدات .

بە ڕای من ئەو تەنیا بەڵگەیەی د. نەسرین فەخری زۆر كەمــە بــۆ ئەوەی ئەو پاشگرە بە ( وە ) دابنرێ . جگە لەوەش سەرنجی ڕاســتی مامۆستا مەسعود محەمەد ، كە دەڵێ : « هیچ مــانعێك نییــە لەوەدا بگوترێت پێشگرەكە تێكڕای (ەوە)یە چونكە لە هەمو ئەو میسالانەدا كە بۆ كار دێنەوە ئەم بزوێنەی پێشەوە ( ە ) دەدیترێت ، تەنــانەت واش دەبێت كە پیتە بزوێن دەبێتە كۆتایی كار ، پیتێكی كۆنسۆنانت دێــت و ئەم بزوێنە دەپارێزێت ، وەك ( هاتۆمەتەوە ــ كە لێرەدا ــ ت ــ هات و بزوێنەكەی پاراســت » . « لە گەلێــك شێوە ئاخــاوتندا دەگــوترێ ( گەڕایەوە ، كوژایەوە . . . ) كە لەو شوێنانەدا پیتێكی ( ی ) پەیوەندی =

أ ــ گۆڕینی مەفهومی وشە ، وەك :

کردن ــ کردنەوە

خواردن ــ خواردنەوە

ب ــ گۆڕینی واتا ، وەك :

بەربوون ــ بەربونەوە(۸۷)

لێکدان ــ لێکدانەوە(۸۸)

---

=

وەك ( نـون الوقـــایە ) دێـت و بزوێنەکـەی سەرەتـــای ( دوە ) دەپارێزێت » ... « بێگومان لەو شێوانەدا ، کە دەبێتە پێشگر ئیمکان نییە بزوێنەکەی پێشەوە ( ە ) خۆ بەدەربخات ، کە ئەمە بەدیهییەکە و کوتانەوەی لزوم نییە » ( بڕوانە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب٤، بەغـدا ، ١٩٧٦ ، ل ٣٧٣ ــ ٣٧٤ ) ، ئەوە ئەو بۆچونەی د. نەسرین فەخری هەڵدەوەشێنێتەوە و ڕایەکی ڕاست و زانستی دێنێتە کایەوە.

سەرەڕای هەمو ئەو بەڵگانە ، پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە لـە زمانی کوردیدا وشە هەن لە پێکهاتنیاندا ( و )ی کۆنسۆنانت بە ڕەوانی لە دوای دەنگی کۆنسۆنانتەوە هـاتوە و پێویسـتی بە بزوێنی ( ە )ی پەیوەندی نەکردوە پێکیانەوە بلکێنێ ، وەك لە ( سروە )دا .

جا ئەمانە ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو پاشگرە دەبێ ( دوە ) بێ ، نەك (وە) و ، بەو پێیە بزوێنی ( ە ) دەبێ ڕەسـەن بێ ، نـەك بۆ پەیوەندی هاتبێتە ناوەوە ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو ڕایەدام کەوا ئەم باسـە هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوەی قوڵتر و تێر و تەسەلتر هەیە .

(۸۷) وشەی «بەربون» بە مانـای (بەرەڵابون) دێـت ، بـەڵام کە پاشـگری (دوە/وە) دەچێتە سەری واتاکەی دەگۆڕێ و مـانای (کەوتنەخوارەوە) دەدات .

(۸۸) وشەی «لێکدان» واتای : ۱ ــ لە یەکتری دانی دوو شـت ، ۲ ــ تێکەڵ کردنی دوو شت بە یەکا ... دەبەخشێت . کەچی کاتێ پاشـگری ( ەوە/وە )ی پێوە دەلکێ ماناکەی دەگۆڕێ و واتـای بیرکردنەوە دەدات .

ج ــ گەڕانەوە . وەك :

ڕۆیشتن ــ ڕۆیشتنەوە

چوون ــ چوونەوە[89]

د ــ دووبارەبوونەوە . وەك :

هەستان ــ هەستانەوە

نوستن ــ نوستنەوە[90]

٢ ــ اندن .

دەوری هەرە سەرەکی ئەم پاشگرە ئەوەیە کە کرداری تێنەپەڕ (الفعل اللازم ــ Intransitive ) دەگۆڕێ بۆ تێپەڕ ( الفعــل المتعدي ــ Transitive) واتە کاتێك پاشگری ( اندن ) دەچێتە سەر چاوگی تێنەپەڕ ، ئەوە دەیکاتە تێپەڕ[91] . وەك :

سووتان + اندن = سووتاندن

نوستن + اندن = نواندن

مردن + اندن = مراندن

چوون + اندن = چواندن

دڕین + اندن = دڕاندن

---

(٨٩) کاتێ پاشگری (ەوە/وە) دەچێتە سەر «ڕۆیشتن» و « چوون » ، دەبنە « ڕۆیشتنەوە » و « چوونــەوە » و مانای گەڕانەوە بۆ هەمان شــوێن بەدی دەکرێ .

(٩٠) وشەکانی « هەستانەوە » و « نوستنەوە » واتای دووبارە بوونەوەی هەمان کار دەگەیەنــن .

(٩١) لەبەر ئەوەی دەوری ســەرەکی (اندن) ئەوەیــە کە کرداری تێنــەپەڕ دەگۆڕێ بۆ تێپەڕ. بۆیە بێر لەوە دەکەینەوە کە بزانین (اندن) ــ (پێشگر)ە یا ( نیشانە )یە. . . بێگومان ئەگەر دەوری ڕوونان نەبینێ و تەنیا مانــای ڕێزمانی بگەیەنێ ، ئەوە دەبێ ( نیشــانە )بێت ... بەڵام ئەم باســە پێویستی بە لێکۆلینەوەی تەواو و زانستی هەیە .

جگە لەوە پاشگرە ( اندن ) کرداری تێنەپەڕ لە دەنگە سروشتییەکان دروست دەکا ، وەك : ( میاو + انـدن = میاواندن ؛ بۆڕە + انـدن = بۆڕاندن ... ) • هەروەها هەندێ ناوی دیکە دەکاتە چاوگ و کرداری تێپـەڕ ، وەك : ( ڕەنـج + انـدن = ڕەنجانـدن ؛ نرخ + انـدن = نرخاندن ... )[٩٢] •

**— ٤ —**

**ئاوەلکرداری داڕێژراو**

لە زمانی کوردیدا پێشگر و پاشگر بە زۆری و بە شێوەیەکی چالاك یاریدەی داڕشتنی ناو و کردار دەدەن ، جاروبار یارمەتی دروستکردنی ئاوەڵناو و ئاوەلکرداریش دەدەن :

أ — پێشگر •

١ — بێ • وەك :

بێگومان ، بێشك ...

٢ — بە • وەك :

بەگوڕ ، بەکوڵ ، بەتەنیا ...

........... هتد •

ب — پاشگر :

١ — ێ• وەك :

هاوینێ ، بەهارێ ، شەوێ ، ڕۆژێ ...

---

(٩٢) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو دەربـارەی پاشگری (اندن) بڕوانـە : د. نەسرین فەخریی ، پاشگری (اندن) لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ — ٢٤٢ •

٢ ـ انه . وەك :

ژیرانه ، پیاوانه[٩٣] ...

٣ ـ ئاسایی . وەك :

شێرئاسایی ، کوێرئاسایی ...

٤ ـ ەکی . وەك :

شەوەکی ، بەیانەکی ...

..... [٩٤]

# وشەی لێکدراو

( الکلمة المرکبة — Compound )

وشەی لێکدراو ئـەو وشەیەیە کە وا بـە لای کەمەوە دوو وشـەی واتاداری تێدابێت .

---

(٩٣) ئەگەر بوترێ ( جلی پیاوانه ) ئەوە وشـەی «پیاوانه» دەبێتە ئاوەڵناو ، چونکە وەسفی ناو دەکا . ئەگەر بوترێ ( شێرکۆ پیاوانه دانیشتووە ) ئەوە وشەی « پیاوانه» دەبێتە ئاوەڵکردار ، چونکـە لێرەدا وەسـفی کردار دەکا ـ واتە چۆنیەتی دانیشتن نیشان‌دەدا .

(٩٤) ئەو ئاوەڵکردارە دارێژراوانەی سەرەوە کە بە یارمەتی پێشگر و پاشگر سازبوون ، جیاوازییان لەگەڵ ئاوەڵکرداری لێکدراودا زۆرە . کەچی مامۆستا نوری عەلـی ئەمین ئەو دوو جـۆرە ئـاوەڵکردارەی ـ واتـە دارێژراو و لێکدراو ـ کە جۆری پێکهاتنیان جودایە وەك یەك دانـاوە . ( بڕوانە : کتێبی « ڕێزمانی کوردی » ، ل ١٨٧ ) .
به وێنه وشەی دارێژراوی «بێگومان» کە لە پێشگری (بێ) و وشەی «گومان» پێکهاتوە ؛ یاخود وشەی دارێژراوی «شەوێ» کە لە وشـەی «شەو» و پاشگری (ێ) پەیدابووە ... جیاوازییـان لەگەڵ وشـەی لێکدراوی « پڕبەدڵ » زۆرە کە لە ئاوەڵنـاوێك ( پڕ ) + ئینتەرفیکس ( بە ) + ناو (دڵ) پێکهاتوە ؛ یاخود وشەی لێکدراوی «پاشەوپاش» کە لە دووپات کردنەوەی وشـەی «پاش» پێکهـاتوە و ئینتەرفیکسی ( ەو ) بە یەکەوەی لکاندوون .

وشەی لێکدراو دەتوانرێ بە گوێرەی بەشــەکانی ئاخاوتن دابەش بکرێ بەسەر ئەم جۆرانەدا :

## ـ ١ ـ
## ناوی لێکدراو

ناوی لێکدراو لەمانەی خوارەوە پێك دێ :

١ ـ دوو ناوی سادە • وەك :

شــاهەنگ ، ماســتاو ، مارماســی ، گوڵاو ، چڵــکاو ، بەفراو ، گاسن[٩٥] •••

٢ ـ دوو ناوی سادە ، بە یارمەتی یەکێك لەم ( ئینتەرفیکس )انە :

أ ـ ( ە ) • وەك :

بەردەنوێژ ، مانگەشەو ، گوڵەگەنم ، چەرمەگا •••

ب ـ ( و ) • وەك :

هێلکەوڕۆن ، لەرزوتا •••

---

(٩٥) هەندێ جار لە وشەی لێکدراودا کورتکردنەوە بەدی دەکرێت . وەك: «کانێسکان» کە لە « کانی + ئاسکان » دروستبوە ؛ « چابۆنەوە » کە لە « چاك + بۆنەوە » ساز بوە ؛ « گاسن » لە «گا + ئاسن» ؛ «کانەبی» لە « کاك + نەبی » ؛ « دەستاڕ » لە « دەست + هاڕ ( ڕەگی کرداری «هاڕین» ) ؛ «مامۆستا » لە « مام + وەستا » [ (و) لە وشەی سادەی « وەستا »دا کۆنسۆنانتە و دەتوانێ لەگەڵ دەنگی (ە)دا بێت کە بە دوایدا هاتوە . کاتێ لەگەڵ وشەی «مام»دا یەك دەگرن ، ئەوە ئەو (و)وە دەبێ بە (ۆ) ـ کە دەنگێکی بزوێنە . جا بۆنە بزوێنی ئەو دەنگە بوە بە هۆی ئەوەی ( ە ) تێدا بچێ ، ئەوەش لەبەرئەوە کە دوو بزوێن پێکەوە نایەن].

جـ ــ ( بە ) ٠ وەك :

کولێرەبەڕۆن ، سەربەگێچەڵ ٠

٣ ــ ناوێکی سادە و ئاوەڵناوێك ، بە یارمەتی ئینتەرفیکس (مۆرفێمی پەیوەندی )ی ( ە ) ٠ وەك :

مێرگەسور ، کێلەسپی

٤ ــ ئاوەڵناو + ناو ، وەك :

ڕەشماڵ ، زەرداو ٠٠٠

٥ ــ ئاوەڵناوێك و ناوێکی سادە ، بە یارمەتی یەکێك لەم ( ئینتەرفیکس )انە :

أ ــ ( ە )

ڕەشەبا ، سەوزەگیا ، تەڕەپیاز ٠٠٠

ب ــ ( و )

گەندوگو ٠٠٠

٦ ــ لە ناوێکی سادە و ڕەگی کردار ٠ وەك :

دارتاش ، دڵخواز ، جلدرو ، پیلانگێڕ ، ڕۆژهەڵات، چاوبەست، لێفەدرو ، کڵاودرو ٠٠٠٠

٧ ــ لە ناوێکی سادە و ڕەگی کردار ، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( و ) ٠ وەك :

دەستوبرد ٠٠٠

٨ ــ لە دو ڕەگی کردار ، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( و ) ٠ وەك :

هات‌وچۆ ، مشت‌ومالّ[٩٦] ، گفتوگۆ

٩ ــ ئاوه‌لکردارێك و ناوێکی ساده . وه‌ك :

به‌رمالّ ، ژێرپیاڵه ، پێش‌نوێژ ، ژێرکراس ، بن‌باخه‌ڵ ...

١٠ــ ناوێکی ساده و وشه‌یه‌کی بێ‌واتا ، به یارمه‌تی ئینته‌رفیکسی ( و ) . وه‌ك :

قه‌رزوقۆڵ ، گیاوگژ ، گوڵ‌ومول ....

١١ــ ڕه‌گی کردار و وشه‌یه‌کی بێ واتا ، بـه یارمه‌تی ئینته‌رفیکس ( و ) . وه‌ك :

کوڵ‌وکۆ[٩٧] ...

١٢ ــ دووپات کردنه‌وه‌ی ناوێك[٩٨] ، به یارمه‌تی ئینته‌رفیکسی (ه) . وه‌ك : قرچه‌قرچ ، ملچه‌ملچ ، چه‌قه‌چه‌ق ، جیڕه‌جیڕ ، لوره‌لور ، گفه‌گف ، بۆڕه‌بۆڕ[٩٩] ....

---

(٩٦) «مشت» ڕه‌گی کرداری «مشتن»ه که هاوواتای «ماڵین»ه. وه«ماڵ»یش ڕه‌گی کرداری «ماڵین»ه ، که به واتای (پاككردنـه‌وه‌ی شـوێنێك بـه گه‌سك یان به شتێکی تر ) دێت . کاتێ ڕه‌گی ئه‌و دوو کرداره یه‌ك ده‌گرن وشه‌یه‌کی نوێ دروست ده‌بێ ــ « مشت‌وماڵ » . هـه‌رچی وشـه‌ی «مشت وماڵ»یشه واتای «زاخاو دانه‌وه و پاككردنـه‌وه‌ی خه‌نجه‌ر و شێر و چه‌قۆ » ده‌به‌خشێ .

(٩٧) « کوڵ » ڕه‌گی کرداری « کوڵان »ه که به‌مانای ( قوڵپدانی شتی شل له سه‌ر ئاگر ) دێت . «کـۆ» واتـای سه‌ربه‌خـۆی نییـه . هـه‌رچی « کوڵ‌وکۆ »یه مانای ( کڵپه‌ی گڕی ئاگر ) ده‌به‌خشێ .

(٩٨) به‌تایبه‌تی ناوی ده‌نگه سروشتییه‌کان .

(٩٩) ئه‌گه‌ر ناوه‌که کۆتایی به بزوێنی ( ه ) بێت ئه‌وه له‌و دوو ( ه )یه ــ واتـه کۆتایی و په‌یوه‌ندی یه‌کێکیان تێ‌ده‌چێ و یه‌کێکیان ده‌مێنێته‌وه .

— ٢ —

## ئاوەڵناوی لێکدراو

ئاوەڵناوی لێکدراو دەکرێ پێکهاتبێ لە :

١ ــ دوو ناو . وەك :

گەردن + بلوور = گەردن بلوور

بەژن + چنار = بەژن چنار

باڵا + عەرعەر = باڵاعەرعەر

٢ ــ ناو + ئاوەڵناو . وەك :

سەر + گەرم = سەرگەرم

ڕوو + ڕەش = ڕووڕەش

دڵ + ڕەق = دڵڕەق

دەست + درێژ = دەستدرێژ

٣ ــ ناو + ناوی بەرکار ( اسم المفعول ) . وەك :

سەر + شکاو = سەرشکاو

زگ + سووتاو = زگسووتاو

دەست + گیراو = دەستگیراو

٤ ــ دوو ناو ، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( بە ) . وەك :

قوڕ + بە + سەر = قوڕبەسەر

لێو + بە + بار = لێوبەبار

ڕوو + بە + خاڵ = ڕووبەخاڵ

٥ ــ ئاوەڵناو + ناو . وەك :

خۆش + باوەڕ = خۆشباوەڕ

پڕ + سوود = پڕسوود

٦ ـ ئاوەڵناو + ناو ، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی (ە) . وەك :

کورت + ە + باڵا = کورتەباڵا

تاریك + ە + شەو = تاریکەشەو

پیر + ە + مێرد = پیرەمێرد

٧ ـ ناو + ڕەگی کردار . وەك :

ئاشتی + خواز = ئاشتیخواز

بار + کێش = بارکێش

سەر + بەست = سەربەست

دەست + بڕ = دەستبڕ

٨ ـ ئاوەڵناو + ڕەگی کردار . وەك :

ڕەش + پۆش = ڕەشپۆش

ڕاست + گۆ = ڕاستگۆ[100]

٩ ـ ژمارە + ناو . وەك :

دوو + دڵ = دوودڵ

چوار + چاو = چوارچاو[101] .

دوو + ڕوو = دووڕوو

١٠ ـ ئاوەڵناو + وشەیەکی بێواتا ، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( و ) . وەك :

---

(١٠٠) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا هەرچەندە ناوی ئەم پێکهاتنەیان هێناوە ، بەڵام هیچ نموونەیەکیان بۆ نەهێناوەتەوە ( بڕوانە : کتێبی ناوبراو ، ل ٤٢ ) .

(١٠١) مامۆستا نوری عەلی ئەمین وای داناوە کە وا گوایا ئەم پێکهاتنە بریتییە لە : ئاوەڵناو + ناو ( بڕوانە : کتێبی « ڕێزمانی کوردی » ، ل ١١٢ ). ئاشکرایە ، کە ( دوو ، چوار ... ) بەر لە هەموو شتێك ژمارەن .

گورج + و + گۆڵ = گورجوگۆڵ

ڕەق + و + تەق = ڕەقوتەق

نەرم + و + تۆڵ = نەرموتۆڵ

١١ ــ ئاوەڵکردارێك + ناوێکی سادە • وەك :

ژێردەست ، ژێرچەپۆك •••

١٢ــ دووپاتکردنەوە • وەك :

کونکون ، وردورد •••(١٠٢)

١٣ــ ئاوەڵکردار + ڕەگی کردار • وەك :

کەمخۆر ، زۆربڵێ •••

**ــ ٣ ــ**

## کرداری لێکدراو

کرداری لێکدراو بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو پێكدێ :

١ ــ بە یاریدەی ناو •

ناو ( مادێ بێ یا مەعنەوێ ) دەتوانێ لە پێکهێنانی کرداری لێکدراودا بەشدار بێ • وەك : ( دەستبڕین ، پێگرتن ••• بیرکردنەوە ، شەرمکردن ••• ) •

---

(١٠٢) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە کتێبی «ڕێزمانی کوردێ»دا باسی بەشی هەرە زۆری ئەو ئاوەڵناوە لێکدراوانەی کردوە کە لێیان دواین . بەڵام ئەوەی لە باسەکەیدا جێگەی ڕەخنە بێ ئەوەیە ، کە هەندێ ئاوەڵناوی دارێژراوی بە لێکدراو داناوە . بە وێنە وشەی « نەمر ، نەبەز ، بەهێز ، بەجەرگ ، نازێك ، بێهێز ... »ی لە ڕیزی ئاوەڵناوی لێکدراودا باسکردوە .
کەریمی ئەیوبێ و ی. ئا. سمیرنۆڤا هەرچەندە لە زۆریان دواون ، بەڵام هەندی پێکهاتنی گرنگیان لە بیر کردوە ، بە وێنە ( ژمارە ١ ، ٨ ... )ی ئەم باسەی ئێمە .

ناوی دارێـژراو و لێکدراویش وەك ناوی سـادە دەتوانن یارمەتی پێکهێنانی کرداری لێکدراو بدەن :

أ ـ ناوی سادە ، وەك :

مل + نان = ملنان[۱۰۳]

سەر + شکاندن = سەرشکاندن

ب ـ ناوی دارێژراو ، وەك :

جێگە+ کردنەوە = جێگەکردنەوە

ڕێگا + گرتن = ڕێگاگرتن

ج ـ ناوی لێکدراو ، وەك :

چلکاو + خواردن = چلکاوخواردن

ماستاو + کردن = ماستاوکردن

٢ ـ بە یاریدەی ئاوەڵناو ،

ئاوەڵناویش ( سادە بێ یا دارێژراو یا لێکدراو ) هەر وەك ناو دەتوانێ

---

(١٠٣) زۆر جار جگە لەو دوو وشە واتادارەی وشەی لێکدراو پێك دەهێنن ، پێشگر یا پاشگریش لە ناو وشەی لێکدراودا دەبینرێ. وەك (مل لێنان، دەستکردنەوە ، چاولێداگرتن ، سەرلێشێواندن ، ڕەشەباهەلکردنەوە ... ) . لیژنەی « زمان و زانستەکانی »ی کۆڕ ئەم جۆرە پێکهاتنەی ناو ناوە « کرداری ئاوێتە » . لە ڕاستیدا ئەم وشانەش هەر وشەی لێکدراون . ئەگەر لەبەر ئەو زیادیيە لیژنە ئەمە بە جۆرێکی دیکە دابنێ ئەو دەم دەبێ واز لەو ڕایە بێنێ کە لە بەشی ( ناو )دا وشەی : ( شەولەبان ، بنبەردەقیلە ، گولەگەنم ، شەکرەسێو . . . )ی بە ناوی لێکدراو داناوە یاخود لە بەشی (ئاوەڵناو)دا وشەی ( گوڵبەدەم ، چاوبەکل ، دەستلەسەرسنگ. . . )ی بە ئاوەڵناوی لێکدراو داناوە و دەبێ بە ئاوێتە ناویان بهێنێ . بەو پێیە دەبێ بۆ ئەو کردارانەش کە لە سێ وشەی واتادار پێکهاتون ، وەك : ( چلکاوخواردن ، سەرخۆش بوون ... ) زاراوێکی تایبەتی دابنێ .

له دروست کردنی کرداری لێکدراودا بەشدار بێ :

أ ـــ ئاوەڵناوی سادە ، وەك :

سوور + بوون = سووربوون

بڵند + کردن = بڵندکردن

ب ـ ئاوەڵناوی داڕێژراو ، وەك :

نەخۆش + کەوتن = نەخۆشکەوتن

بەهێز + بوون = بەهێزبوون

جـ ـ ئاوەڵناوی لێکدراو ، وەك :

سەرخۆش + بوون = سەرخۆشبوون

ڕۆژەش + کردن = ڕۆژەشکردن

٣ ـ هەندێ لەو وشانەی لە زمانی کوردیێ ئەمڕۆدا مانای سەربەخۆیان نییە ، وەك ( تووش ، فڕێ ، بەخێــو ، نقوم ، دەرباز ، تۆڕ ، پــەك ، واز، هان ... ) دەتوانن لە پێکهێنانی کرداری لێکدراودا بەشداربن ، وەك :

تووش + بوون = تووشبوون

فڕێ + دان = فڕێدان

بەخێو + کردن = بەخێوکردن

نقوم + بوون = نقومبوون

دەرباز + بوون = دەربازبوون

تۆڕ + هەڵدان = تۆڕهەڵدان

پەك + کەوتن = پەککەوتن

واز + هێنان = وازهێنان

هان + دان = هان‌دان[١٠٤]

............... هتد .

( کردن ) و (بوون) و (دان) و (نان) و (بردن) و (گرتن) و (هێشتن) و (خواردن) و (کەوتن) و (هاتن) ... لـە پێکهێنانی کرداری لێکدراودا دەورێکی گەورە دەبینن .

له نێو ئەو کردارانەدا کە لە سەرەوە ناومان بردن ، کرداری ( کردن ) بۆ پێکهێنانی کرداری لێکدراو لە هەمویان زۆرتر بـەکار دەهێنرێ . لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی زۆر وشە هەن بەهاریکاریی ( کردن ) دروست بوون . هەرچەندە کرداری ( کردن ) بە زۆریی لەگەڵ ناودا یەك دەگرێ ، بەڵام لە هەمان کاتدا لەگەڵ ئاوەڵناویشدا کاریگەرە :

کرداری ( کردن )

١ ـ لەگەڵ ناودا .

زین + کردن = زین‌کردن
گوڵ + کردن = گوڵ‌کردن
تۆبە + کردن = تۆبەکردن
گاڵتە + کردن = گاڵتەکردن

.......... هتد .

---

(١٠٤) ئەوەی لەم ڕووەوە جێگەی سەرسوڕمان بێ ئەوەیە کە عەمید ئەحمەد حەسەن ( شێ ، گل ، فێر ، فریا ، نقوم ، پیشان ، قوت ، یەك ، پەیدا، بەرپا ، گلۆر ، تێپەڕ ، گوم ... )ی بە پێشگر داناوە ( عەمید ئەحمەد حەسەن، پێشگر و پاشگر ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، ب٣ ژ١، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٢٢ ـ ٣٢٣ ) . بێ‌گومان ناتوانرێ ئەوانە بە پێشگر دابنرێن ، بەڵکو وشەن ، هەرچەندە زۆریان مانای سەربەخۆی خۆیان نییە و سەربەخۆ بەکار نایەن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وشەی داڕێژراو پێك‌ناهێنن . دەبینین وشەی لێکدراو دروست‌دەکەن .

٢ ــ لەگەڵ ئاوەڵناودا •

سور + کردن = سورکردن
گەورە + کردن = گەورەکردن
جوان + کردن = جوانکردن
گەرم + کردن = گەرمکردن
•••••••••• هتد •

## کرداری ( بون )

هەرچەندە کرداری ( بون ) لەگەڵ ناو و ئاوەڵناودا ڕێــك دەکەوێ ، بەڵام لەگەڵ ئاوەڵناودا پتر دەگونجێ •

١ ــ لەگەڵ ئاوەڵناودا • وەك :

ڕەش + بون = ڕەشبون
زل + بون = زلبون
تێر + بون = تێربون
هەژار + بون = هەژاربون
••••••••••••• هتد •

٢ ــ لەگەڵ ناودا • وەك :

گەرما + بون = گەرمابون
سەرما + بون = سەرمابون
••••••••••••• هتد •

هەرچی کرداری (دان) و (نـــان) و (بردن) و (گرتن) و (هێشتن) و (خواردن) و (کەوتن) و (هاتن) ••••یشە بە پێی توانای خۆیان لەدروست

کردنی کرداری لێکدراودا بەشداردەبن • وەك :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| بڕیار | + | دان | = | بڕیاردان |
| جنێو | + | دان | = | جنێودان |
| ناو | + | نان | = | ناونان |
| ڕاو | + | نان | = | ڕاونان |
| ئابڕوو | + | بردن | = | ئابڕووبردن |
| ناو | + | بردن | = | ناوبردن |
| وێنە | + | گرتن | = | وێنەگرتن |
| بین | + | گرتن | = | بینگرتن |
| بانگ | + | هێشتن | = | بانگهێشتن |
| جێ | + | هێشتن | = | جێهێشتن |
| خول | + | خواردن | = | خولخواردن |
| نان | + | خواردن | = | نانخواردن |
| سەر | + | کەوتن | = | سەرکەوتن |
| ژێر | + | کەوتن | = | ژێرکەوتن |
| ناو | + | هاتن | = | ناوهاتن |
| سەر | + | هاتن | = | سەرهاتن |

.............. هتد[١٠٥] .

---

(١٠٥) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە (ل ١١٩ ـ ١٢٩ )ی کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری »دا بە دوور و درێژی دەربارەی کرداری لێکدراو دواون . ئێمەش بەتایبەتی سوودێکی زۆرمان لەم بەشەی ئەو کتێبە وەرگرتووە و گەلێك نموونەمان لێ دەرهێناوە .

– ٤ –

## ئاوەڵکرداری لێکدراو

ئاوەڵکرداری لێکدراو دەگونجێ پێکهاتبێ لە :

١ ــ دووپات کردنەوەی ناو ، ژمارە ، ئاوەڵناو ، ئاوەڵکردار . وەك :

پۆلپۆل ، دوودوو ، کەمکەم ....

٢ ــ دووپات کردنەوە بە یارمەتیی :

أ ــ ئینتەرفیکسی ( او ) وەك :

پشتاوپشت ...

ب ــ ئینتەرفیکسی ( ەو ) . وەك :

بانەوبان ، پاشەوپاش ...

٣ ــ ئاوەڵناو + بە + ناو . وەك :

پڕ بە دڵ ، پڕبەدەم .....

............ هتد .

★ ★ ★

# فەرهەنگۆك*

| | | |
|---|---|---|
| ئاوازمدار | المجهور | Voiced |
| ئاوەلکردار | الظرف | Adverb |
| ـ ئاوەلکرداری دارێژراو | الظروف المشتقة | Derivational adverb |
| ـ ئاوەلکرداری سادە | الظروف البسيطة | Simple adverb |
| ـ ئاوەلکرداری لێکدراو | الظروف المركبة | Compound adverb |
| ئاوەلناو | الصفة | Adjective |
| ـ ئاوەلناوی دارێژراو | الصفة المشتقة | Derivational adjective |
| ـ ئاوەلناوی سادە | الصفة البسيطة | Adjective simple |
| ـ ئاوەلناوی لێکدراو | الصفة المركبة | Compound adjective |

---

* پێشتر لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا فەرهەنگۆکمان لە پاشکۆی کتێبی « زمانی کوردیی لەبەر رۆشنایی فۆنەتیکدا » و «وشەی زمانی کوردیی»دا بۆ ئەو زاراوانە رێكخستبۆ کە لەو دوو کتێبەدا بەکار هێنرابوون . وا ئێستاش هەر بەو چەشنە لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا فەرهەنگۆکێك بۆ ئەو زاراوانە رێكدەخەین کە لەم کتێبەدا بەکار هێنراون ، بەتایبەتی ئەو زاراوانەی پەیوەندییان بە بابەتی وشەرۆنانەوە هەیە و لەم کتێبەدا بەرچاو دەکەون .

کێشەی زاراو لە نووسینی ئەم کتێبەشدا ئەرکێکی گەورە و کارێکی دژوار بوو . سەرەڕای ئەو هەوڵ و کۆششە زۆرەش لەو بارەیەوە داومانە، هێشتا گومانمان نییە کە کەم و کورتی و ناتەواوی هەر تێدایە . ئەو زاراوانەی زووتر دانرابوون و بە لامانەوە لەبار و ڕەسەن بوون وەرمان گرتن . ئەوانەش کە نەبوون ، یاخود هەبوون بەلام لامان جوان و گونجاو نەبوون ، ئەوە بە سەلیقە و لێکدانەوە و بەشوێنەدا گەڕان جێگەمان پڕکردنەوە .

بێگومان دەزانین هیچ کارێك ، بەتایبەتی کاری سەرەتایی و تازە ، بێ کەم و کورتی نابێ و دوور نییە لە هەڵبژاردن و داڕشتن و دۆزینەوە و دانانی ئەو زاراوانەدا تووشی هەڵە بووبین . جا لەبەر ئەوەی ئەو هەڵەیە نەبێتە هۆی تێنەگەیشتن لە باسەکە ، لە زۆر شوێندا بەرانبەر بە زاراوە کوردییەکە زاراوە عەرەبی و ئینگلیزییەکەشمان داناوە. ئەم ڕێبازە لە هەموو نووسینەکانماندا ڕەچاو کراوە .

| | | |
|---|---|---|
| Diminutive | التصغير | بچوككردنەوە |
| Vowels | حروف العلة | بزوێن |
| Parts of speech | اقسام الكلام | بەشەكانی ئاخاوتن |
| Suffix | اللاحقة | پاشگر |
| Connection | العطف | پەیوەندی |
| Letter | الحرف | پیت |
| Prefix | السابقة | پێشگر |
| Composition, Compounding | التركيب | لێكدان |
| Pronoun | الضمير | جێناو |
| Infinitive | المصدر | چاوگ |
| Derivation | الاشتقاق | داڕشتن |
| Sound | الصوت | دەنگ |
| Sentence | الجملة | ڕستە |
| Root | جذر | ڕەگ |
| Roots of verb | جذر الفعل | ـ ڕەگی كردار |
| Language | اللغة | زمان |
| Linguist | عالم اللغة ، لغوي | زمانناس |
| Linguistics | علم اللغة | زمانناسی |
| Syntax | علم النحو | سینتاكس |
| Allomorph | نمط المورفيم | شێوەی مۆرفێم |
| Phrase | العباره ( العقدة ) | فرێز |
| Phonetics | علم الأصوات | فۆنەتیك |
| Phoneme | الوحدة الصوتية | فۆنێم |
| Imperative | الأمر | فەرمان |
| Voiceless | المهموس | كپ |
| Verb | الفعل | كردار |
| Transitive | الفعل المتعدي | ـ كرداری تێپەڕ |
| Intransitive | الفعل اللازم | ـ كرداری تێنەپەڕ |
| Derivational verb | الفعل المشتق | ـ كرداری داڕێژراو |
| Simple verb | الفعل البسيط | ـ كرداری سادە |
| Compound Verb | الفعل المركب | ـ كرداری لێكدراو |
| Consonants | الحروف الصحيحة | كۆنسۆنانت |
| Confix | | كۆنفیكس |
| Affix | | گیرەك ( ئافیكس ) |

| | | |
|---|---|---|
| مانا | المعنى | Meaning |
| ـ ماناى دارێژه | المعنى 'الأشتقاقي | Derivational meaning |
| ـ ماناى نیسبێ | المعنى النسبي | Relational meaning |
| مۆرفۆلۆژى | علم الصرف | Morphology |
| مۆرفێم | المورفيم | Morpheme |
| ـ مۆرفێمى ڕیشەیێ | المورفيم الجذري | Root morpheme |
| ـ مۆرفێمى وشه دارێژەر | المورفيم المكون للكلمة | Derivational morph. |
| ـ مۆرفێمى وشەگۆڕ | المورفيم المغير للكلمة | Inflexional morph |
| ناو | الاسم | Noun |
| ـ ناوى چاوگ | اسم المصدر | Action noun |
| ـ ناوى دارێژراو | الاسم المشتق | Derivational noun |
| ـ ناوى ساده | الاسم البسيط | Simple noun |
| ـ ناوى لێکدراو | الاسم المركب | Compound noun |
| ـ ناوى واتا | الاسم المعنوي | Abstract noun |
| ناوگر | الواسطة | Infix |
| نیشانه | العلامة | Marker |
| ـ نیشانەى ناسیاوێ | علامة التعريف | Difinite articles |
| ـ نیشانەى نەناسیاوێ | علامة التنكير | Indefinite article |
| وشه | الكلمة | Word |
| ـ وشەى دارێژراو | الكلمة المشتقة | Derivational word |
| ـ وشەى ساده | الكلمة البسيطة | Simple word |
| وشەى لێکدراو | الكلمة المركبة | Compound word |
| ـ وشەى نوێباو | الكلمة المولدة | Neologism |
| وشه ڕۆنان | بناء الكلمة | Word - formation |

# ســـــەرچاوە

## بە زمانی کوردیی


(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد . پێشگر و پاشگر ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم . بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣١٩ ـ ٣٥٧ .

(٢) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد . ڕێزمانی کوردیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٣) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمیی . بۆژاندنەوەی زمان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم . بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٤٣ ـ ١٩٧ .

(٤) تۆفیق وەهبیی ، دەستوری زمـانی کوردیی ، جزمی یەکەم ، بەغـدا ، ١٩٢٩ .

(٥) ڕێزمانی ئاخـاوتنی کوردیی بەپێـی لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانستەکانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٩٨ ـ ٤٩٦ ؛ ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٤١ ـ ٣٥٨ ؛ ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٨٩ ـ ٤٠٠ .

(٦) ڕێزمانی ئاخـاوتنی کوردیی بەپێی لێکۆڵینـەوەی لیژنەی زمـان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٧) زاراوە زانســتییەکان ، دانـان و لێکـۆڵینـەوەی لیـژنەی زاراوە زانستییەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٨) زاراوەی هەمەچەشنە ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشەکیی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجیی مارف ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

(٩) شێخ محەمەدیی خاڵ . پێشگر و پاشـگر ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم . بەشـی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٥٦ ـ ٢٧٩ .

(١٠) فارۆق عومەر صدیق . وشەسـازیی لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » . ب٣ ، ژ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤١٧ ـ ٥٢٣ .

(١١) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشەکیی و ڕێکخسـتنی د. ئەوڕەحمانی حـاجیی مارف ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(١٢) د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی ، پاشکۆی ( درا ) ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٥ ـ ١٣١
(١٣) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .
(١٤) مەسعود محەمەد ، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ ـ ١٠٢ .
(١٥) مەسعود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(١٦) د. نەسرین فەخری ، پاشگر و پێشگری : ( ڤە ـ یان ـ وە ) لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٣٤ ـ ٢٧٣ .
(١٧) د. نەسرین فەخری ، پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ ـ ٢٤٢ .
(١٨) نوری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ .
(١٩) نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

### بە زمانی عەرەبی

(٢٠) الدكتور ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، الطبعة الرابعة، القاهرة، ١٩٧٢.
(٢١) الدكتور ابراهيم السامرائي ، فقه اللغة المقارن ، بيروت ، ١٩٦٨ .
(٢٢) الدكتور ابراهيم السامرائي ، مباحث لغوية ، النجف ، ١٩٧١ .
(٢٣) توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الأول ، الباب الثاني ، بيروت ، ١٩٥٦ .
(٢٤) د. كمال محمد بشر ، دور الكلمة في اللغة ( مترجم عن الانجليزية ) ، الطبعة الثانية ، القاهرة ، ١٩٦٩ .
(٢٥) محمد الانطاكي ، الوجيز في فقة اللغة ، حلب ، ١٩٦٩ .
(٢٦) منير البعلبكي ـ « المورد » قاموس انكليزي ـ عربي ، بيروت ، ١٩٧٢ .

## به زمانی ڕوسی

(٢٧) ئۆ. س. ئاخمانۆڤا . فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .
(٢٨) ئەکادیمیەی زانستی یەکێتی سۆڤێت ، ڕێزمانی زمانی ڕوسی ، بەرگ ١ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٣ .
(٢٩) ك. ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .
(٣٠) چ. خ. باکایێڤ . زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .
(٣١) چ. خ. باکایێڤ . زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .
(٣٢) ڕ. ئا. بوداگۆڤ . سەرەتایێك بۆ چوونە ناو زانستی زمانەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٥٨ .
(٣٣) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی . سەرەتایێکی زماناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ . ١٩٦٧ .
(٣٤) ی. ئا. زیمسکایا . وشە چۆن سازدەبێ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .
(٣٥) ئا. م. زیمسکی . س. ی. کریوچکۆڤ ، م. ڤ. سڤێتلایێڤ ، زمانی ڕوسی . بەرگی یەکەم . چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .
(٣٦) م. د. ستیپانۆڤا . وشەڕۆنانی زمانی ئەڵەمانی ئەمڕۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦ .
(٣٧) ن. س. ڤالگینا . د. ی. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ڤ. ڤ. تساپکیتیڤیچ . زمانی ڕوسی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ .
(٣٨) گ. س. کاچکینا . کێشەی واتای مۆرفێم ، لێنینگراد ، ١٩٦٣ .
(٣٩) گ. ئا. کیمۆڤ . فۆنێم و مۆرفێم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .
(٤٠) ق. کوردۆ . دەستوری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ــ لێنینگراد ، ١٩٥٧ .
(٤١) ق. کوردۆ . ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، « ڕێزمان و مێژوی زمانەکانی ڕۆژهەڵات » . لێنینگراد ، ١٩٥٨ ، ل ١٠٩ ــ ١٤٢ .
(٤٢) ق. کوردۆ . دوو بنچینەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، « کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٩ ، ب ٢٩ .
(٤٣) ق. کوردۆ . زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .

(٤٤) ئا. ن. گفۆزدێف ، زمانی ئەدەبی ڕۆسی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چاپی سێیەم . مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(٤٥) ئی. گ. گۆلانۆف ، مۆرفۆلۆژی زمانی ڕۆسی ئەمڕۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

## به زمانی ئینگلیزی

(٤٦)
Bazell C. E. Linguistic typology, London, 1958 .

(٤٧)
Bazell C. E. Meaning of the morpheme, (( Word )) , v. 18, 1962, No. 1 - 2 .

(٤٨)
Harris Z. From Morpheme to Utterance. Languge, USA, 1946.

(٤٩)
Hockett Ch. F. A course in modern linguistics, New york, 1958.

(٥٠)
Ullman S. Semantics An introduction to the Science of meaning, Oxford, 1963.

# ناوەرۆك

لاپەڕە

لاپەڕە

